# پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان

# و

# ڕەنجی بیست ساڵە

د. نووری تاڵەبانی

چاپی یەکەم

- ناوی کتێب: پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان و ڕەنجی بیست ساڵە
- نووسین: دکتۆر نووری تاڵەبانی
- تیراژ: 500 دانە
- چاپ: نووسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (233)ی ساڵی 2015ی دراوەتێ.

# پێڕست

# پێشگۆتن

پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان، کە پەرلەمانی هەرێم لە خولی دووەمیدا بە زۆرینە لە 24ی حوزەیرانی 2009دا پەسندی کرد، دەبوو لە تەمووزی هەمان ساڵی 2009دا دەنگدەرانی هەرێم دەنگی لەسەر بدەن. ئەو پرۆژەیە کە تا ئێستا وەکو پرۆژە ماوەتەوە لە ڕووی قانوونی و زمانەوانییەوە کەموکوڕیی تێدایە. پێشتر لە مانگی حوزەیرانی 2006دا چەند تێبینییێکم لەسەر بە شێك لە کەموکوڕییەکانی ئەو پرۆژەیە خستووەتە بەرچاو لیژنەی دەستووری لە پەرلەمانی هەرێم، بەڵام بە پاساوی ئەوەی کاتی تەماشاکردنەوە و پێداچوونەوەی بەسەرچووە، تەماشای ئەو تێبینییانە نەکرا.

پرۆژەی دەستووری هەرێم سەرەتا بە زمانی عەرەبی و بە بیرکردنەوەییێکی عەرەبی ئامادەکرابوو، لیژنەی دەستووری ئەرکی وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی کوردی بە بەندە سپارد. لە کاتی پشووی هاوینەی پەرلەمان لە مانگی تەمووز و ئابی 2006 ئەو ئەرکەم جێبەجێ کرد و لە کۆتایی مانگی ئابدا پرۆژە وەرگێڕاوەکەم بە چاپکراوی ڕادەستی سەرۆکی لیژنەکە کردەوە. بەڵام لەو ماوەی کە خەریکی ئەو ئەرکە بووم، لیژنەی دەستووری بێ ئاگادارکردنەوەی من و چەند ئەندامێکی تر، کۆبوونەوەیەکی (نائاسایی) لە 20ی ئابی 2006دا سازکردبوو، کە نزیکەی سێیەکی ئەندامانی لیژنەکە ئامادەی ئەو کۆبوونەوە نەبوون. لەو کۆبوونەوەدا دەستکاری (22) مادده و بڕگە کرابوو. بەپێی ماددەی (6) لە پێڕەوی ناوخۆی پەرلەمان ساڵی 1992ی هەموارکراو، کۆبوونەوەی نائاسایی تایبەتە بە پەرلەمان، بە چەند مەرجێك. لەو ماددەدا باس لە کۆبوونەوەی (نائاسایی) لیژنەکان نەکراوە، (قیاس)یش لەنێو ئەو دوو حاڵەتەدا ناکرێت. لە یەکەم کۆبوونەوەی لیژنەی دەستووری، کە لە سەرەتای مانگی ئەیلوولی 2006دا بەسترا، ڕەخنەم لەو کۆبوونەوە نائاساییەی لیژنەکە گرت، بەڵام گوێ لە ڕەخنەکەم نەگیرا. پرۆژەکە بەو دەستکارییانەوە لە 21ی ئەیلوولی 2006دا بڵاوکرایەوە و داواشکرا لە هەموو لایەنە پەیوەندیدارەکان ڕا و سەرنجی خۆیان لەسەر پرۆژەکە بۆ لیژنەکە بنێرن. ژمارەیەکی زۆر لە ڕێکخراوانی سیاسی و مەدەنی و کەسانی پسپۆر و شارەزا تێبینیی خۆیان بۆ لیژنەکە نارد، دەبوو لیژنەکە کۆببێتەوە بۆ تەماشاکردنیان، بەڵام

دەستەی سەرۆکایەتیی لیژنەکە بەشێك لەو تێبینییانەی بەلاوە نابوو، بە پاساوی ئەوەی بێ سوودن و بەشەکەی دی لە ژوورێکی نزیك ژووری سەرۆکی لیژنەکەی دانابوو، تا ئەندامان لەوێ تەماشای بکەن! لیژنەی دەستووری تا دەستپێکردنی پشووی هاوینەی پەرلەمان لە تەمووزی 2008 کۆنەبووەوە. لە 7ی تەمووزی 2008 کۆبوونەوەیەکی دیکەی (نائاسایی) سازکرد، کە بەشداریم تێدا نەکرد، جارێکی تر دەستکاری لە پرۆژەکەدا کردبوو.[1] پرۆژەکە بەو دەستکارییانەوە، لە 24ی حوزەیرانی 2009دا خرایە بەردەم پەرلەمانی هەرێم و بە زۆرینە پەسند کرا. پێش ئەو دەنگدانەی پەرلەمان بە پرۆژەکە، پەرلەمان بە پەلە دەنگی لەسەر پرۆژە قانوونی هەموارکردنەوەی قانوونی پەسندکردنی پرۆژەی دەستووری هەرێم ژمارە (16)ی ساڵی 2008 دا.

پرۆژەی دەستووری هەرێم کە تا ئێستاش پرۆژەیەو دەنگی لەسەر نەدراوە، پاش پەسندکردنی دەبێتە یەکەم دەستوور لە مێژووی گەلەکەمان و وەکو بەڵگەنامەیێکی قانوونیی گرینگ دەمێنێتەوە. ئەو دۆکیمەنتە دەبێ بە باشترین شێوە ئامادە بکرێت و ماددەکانی بە زمانێکی قانوونیی ڕەوان دابڕێژرێن. قانوونی ژمارە (16)ی ساڵی 2008ی هەموارکراو، کە تایبەتە بە پەسندکردنی پرۆژەی دەستووری هەرێم، ڕێگەی بە پەرلەمانی هەرێم نەداوە بە پرۆژەکەدا بچێتەوە، بۆیە پەرلەمان نەیتوانی کەموکوڕییەکانی ئەو پرۆژەیە چاك بکاتەوە پێش دەنگدان لەسەری، بە پاساوی ئەوەی پەرلەمانی هیچ وڵاتێك گفتوگۆی لەسەر پرۆژە دەستووری وڵاتی خۆی نەکردووە و پرۆژەی دەستووری عێراقی ساڵی 2005 ئەویش هەر بەو شێوە پەسندکراوە. ئەو بۆچوونە بەو موتلەقییە ڕاست نییە، چونکە یەکەم پرۆژە دەستووری عێراق، کە لە ساڵی 1925 (ئەنجومەنی دامەزرێنەر/ الجمعية التأسيسية) پەسندی کردووە، دەستکاری لە بەشێك لە ماددەکانی کردووە. پرۆژەی دەستووری عێراقی ساڵی 2005 کە زۆر بە پەلە پەسندکرا لەبەر هۆی سیاسی، بووە هۆی ئەو کەموکوڕییانەی دواتر دەرکەوتن و تا ئێستاش چارەسەر نەکراون.

---

1 تەماشای: (چەند تێبینییەك لەسەر پرۆژەی دەستووری هەرێم کە لە 24ی حوزەیرانی 2009دا پەسندکرا) بکە، کە لە ڕۆژنامەی (ئاوێنە)، ژمارە (179)، 2009/6/30 بلاْوکراوەتەوە.

چەندین پسپۆڕ و شارەزا لە کوردستان و دەرەوە دەمێکە داوای هەموارکردنەوەی پرۆژەی دەستووری هەرێم دەکەن، بە مەبەستی چاککردنی کەموکورپییەکانی پێش پەسندکردنی. لەم ڕووەوە بەشێکیان پێشنیازی دامەزراندنی لیژنەیەکی تازە دەکەن بە مەرجێك ئەندامانی کەسانی پسپۆڕ و شارەزا بن و پێشتر بەشدارییان لە ئامادەکردنی پرۆژەکە نەکردبێ. ئەم کارە تەنیا بە ڕێککەوتن لەنێو فراکسیۆنەکانی ناو پەرلەمان دەکرێت.

هۆی بەشێکی زۆر لەو گرفت و کێشانەی بەرەوڕووی هەرێمی کوردستان بوونەوە نەبوونی دەستوورە، کە دەبوو لە ساڵی 1992 ببێتە خاوەنی دەستووری خۆی، هەتا ئەگەر لە شێوەی دەستوورێکی کاتیش بووایا.

پەسندکردنی دەستوورێکی مۆدێرنی گونجاو بۆ هەرێمی کوردستان لەم بارودۆخە سیاسییە کە کوردستان و عێراق و ناوچەکە پێیدا تێدەپەڕێ سەنگێکی قورس بە هەرێمی کوردستان دەبەخشێت و دەبێتە هۆی ئەوە بەشداری لەو گۆڕانکارییانەدا بکات، کە چاوەڕێی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەکەن. هەرێمێك شەرعییەتی دەستووری هەبێت لەسەر ئاستی ناوەوە و دەرەوە، دەوڵەتان و لایەنە نێودەوڵەتییەکان بە جیددییەوە تەماشای دواکارییە ڕەواکانی دەکەن.

ئەو تێبینییانەی لەسەر پرۆژەی دەستووری هەرێم لێرەدا بڵاوم کردوونەتەوە، لەگەڵ بەشێك لەو بابەتانەی پەیوەندییان بە دەستوورەوە هەیە بە نووسین بن یان بە چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەوانی، لێرەدا کۆکراونەتەوە. مەبەستی سەرەکی لە دووبارە بڵاوکردنەوەیان لە دووتوێی ئەم کتێبەدا، چاککردنی کەموکوڕییەکانی ئەو پرۆژەیە پێش ئەوەی بخرێتە بەردەست دەنگدەران بۆ ئەوەی دەنگی لەسەر بدەن.

دەقی ئەو پرۆژە دەستوورەی لە ساڵی 1992دا بە زمانی عەرەبی ئامادەم کردبوو، لەگەڵ دەقە ئینگلیزییەکەی، هەردووکیان لێرەدا بڵاوکراونەتەوە. لە مانگی ئەیلوولی ساڵی 2004دا کۆنفرانسێکی نێودەوڵەتی لە زانکۆی (پرنستن)ی ئەمریکی بەسترا بۆ گفتوگۆکردن لەسەر دواڕۆژی عێراق لە ڕووی دەستوورییەوە. شاندێکی کوردی بەشداریمان لەو کۆنفرانسە کرد، کە تێیدا بابەتێکم لەسەر پرۆژە دەستووری ساڵی 1992 پێشکەش بەو کۆنفرانسە کرد. بەشی هەرە زۆری لایەنەکانی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی کە بەشدارییان لەو کۆنفرانسەدا کردبوو ناڕەحەت بوون لە پێشکەشکردنی ئەو

بابەتــە، بــەڵام قانوونناســە ئەمریکاییــەکان تێبینیــی بــە ســوودیان خــستە ڕوو بــۆ دەوڵەمەندکردنی پرۆژەکە.

ئەم کتێبـە هـەوڵێکی دیکەیـە بـۆ چاککردنی کەموکوڕییـەکانی پـرۆژەی دەسـتووری هەرێمی کوردستان، کە دەبوو زووتر پەسند بکرێ. مانەوەی هەرێم بـەبێ دەسـتوور لـە بەرژەوەنـدیی هـیچ لایـەنێکی سیاسـی نییـە. هـەموو خـەڵکی کوردسـتان پـشتیوانی لـە پرۆســەی پەســندکردنی دەســتوور دەکــەن، بــە مــەرجێك دەســتوورێکی مــۆدێرنی پێشکەوتوو و گونجاو بێت بۆ ئەم سەردەمە. هەروەها ئەو دەسـتوورە دەبێتـە بنـەما بـۆ دەستووری بەشانەکانی دیکەی کوردستان، پاش رزگاربوونیان و بەدەستهێنانی ئازادی.

هەولێر 2015/5/4

# چەند تێبینیەك لەپێناو چاككردنی كەموكوڕییەكانی

# پرۆژەی دەستووری هەرێمی كوردستان

ئەو رستانەی **لەنێو كەوانەدا** بە (ڕەشی) نووسراون بەشێك نین لە پرۆژە دەستوورەی هەرێمی كوردستان كە لە 24ی حوزەیرانی 2009دا دەنگی لەسەر درا، هەموویان سەرنج و تێبینین لەسەر ئەو پرۆژەیە. لە 20ی حوزەیرانی 2006 (لیژنەی پێداچوونەوە بە پرۆژەی دەستووری هەرێمی كوردستان) ئەركی وەرگێڕانی ئەو پرۆژەی پێ سپاردم، كە لە سەرەتاوە بە عەرەبی ئامادەكرابوو. وەرگێڕانی بۆ كوردی كارێكی ئاسان نەبوو، چونكە بەبیركردنەوەیەكی عەرەبی داڕێژرابوو. دەستووری هەرێمی كوردستان پاش پەسندكردنی دەبێتە بەڵگەنامەیەكی نەتەوەیی، بۆیە پێویستە بە زمانێكی كوردیی ڕەوان دابڕێژرێ. ئەو (پێشەكی)یەی لێرە بڵاوكراوەتەوە، (دیباجە)ی پرۆژەكەی 24ی حوزەیرانی 2009 نییە، بەشێكە لەو (پێشەكی)یەی كە بۆ ئەو پرۆژەی دەستووری ساڵی 1992 ئامادەم كردووە.

پرۆژەی دەستووری هەرێم بنەمای دەستووریی چاكی تێدایە، كەسیك ناتوانێ نكووڵی لەو ڕاستییە بكات. بەشێك لەو بنەمایانەی لە پرۆژەی دەستووری ساڵی 1992 وەرگیراون، وەكو دانان بە مافی چارەنووس بۆ گەلی كوردستان و دامەزراندنەوەی دەوڵەتی عێراق لەسەر بنەمای ڕێككەوتنی ئارەزوومەندانە.

پاش وەرگێڕانی پرۆژەكە، (لیژنەی دەستووری) داوای لە چەند ئەندامێكی كردبوو بە دەقە وەرگێڕاوەكەدا بچنەوە، ئەوە كارێكی باش بوو، بەڵام دەبوو ئاگاداری منیش بكرێت، تا هاوكارییان بكەم. لەوە دەچێ بەشێك لە وشە و دەستەواژەكانی ناو پرۆژە عەرەبییەكە بە دەقاودەقی وەریانگێڕابێتە سەر زمانی كوردی، ئەوەش لە ڕووی زمانەوانییەوە دروست نییە، چونكە هەموو زمانێك تایبەتمەندیی خۆی هەیە. (یاداشتی ڕوونكردنەوە)ی پرۆژەكە، لەگەڵ (دیباجە)كەی سەرۆكی لیژنەكە خۆی ئامادەی كردوون، بێ ئەوەی لیژنەكە ئاگاداركرابێت.

پرۆژەی دەستووری هەرێم كە لە 24ی حوزەیرانی 2009دا دەنگی لەسەردرا، تێبینیی قانوونی و زمانەوانی لەسەر هەیە. لەم كتێبەدا دەستكاریی دەقە پەسندكراوەكەی پرۆژەكە نەكراوە، چونكە لە ڕووی قانوونییەوە ئەو دەقەیە كە

پەرلـەمان دەنگـی لەسـەر داوە، تـا پرۆژەکـە هـەموار نەکرێتـەوە، کەسـێك نـاتوانێ دەستکارییان بکات.

**"بە ناوی خوای بەخشندە و میهرەبان"**

**پێشەکی**

**{ لە دێر زەمانەوە کورد لەو ناوچە جوگرافیایەی بە کوردستان ناسراوە دەژیت و وڵاتەکەی بۆ ماوەیێکی زۆر لە ژێر دەسەڵاتی چەند دەوڵەتێکی داگیرکەردا بووە، بۆیە کاتێ پەیماننامەی (سێڤەر)ی نێودەوڵەتی، کە لە ساڵی 1920دا مۆرکرا و لە بڕگەکانی (62 و 63 و 64) باسی لە پرسی کورد کرد لەسەر بنەمای مافی دیاریکردنی چارەنووس و کوردی وەك نەتەوەیەك ناوبرد، ئومێدێکی بە کورد بەخشی. بەڵام بەرژەوەندیی چەند دەوڵەتێکی زلهێز لەگەڵ ئەوەدا نەبوو قەوارەیەکی سیاسی بۆ کورد دابمەزرێت. کوردستان جارێکی تر دابەش کرایەوە، بەشێکی خرایە سەر سنووری دەوڵەتی عێراق، کە لە ساڵی 1921دا لە دوو ویلایەتی بەغدا و بەسرا دروستکرابوو. لکاندنی ئەو بەشەی کوردستان بە دەوڵەتی عێراق لە ساڵی 1925دا بەپێی بڕیاری (ئەنجومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان) بوو، بەڵام بە چەند مەرجێك، کە دەبوو دەوڵەتی عێراق جێبەجێیان بکات. (کۆمەڵەی نەتەوەکان) لە ساڵی 1932دا بڕیاری بە ئەندام وەرگرتنی دەوڵەتی عێراقی لەو دەزگا نێودەوڵەتییە دا، بەڵام جەختیش لەسەر ئەوە کرابووەوە، کە عێراق دەبێ پابەند بێت بەو مەرجانە و بەبێ ڕەزامەندیی کۆمەڵەی نەتەوەکان نابێ کارێك بکات ببێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی ئەو بڕیارە نێودەوڵەتییە.**

**هەردوو حکومەتی عێراق و بەریتانیا لە ڕاگەیاندنێکی هاوبەشدا، کە لە 25ی کانوونی یەکەمی 1922دا بڵاوکرابووەوە، داوایان لە سەرانی کورد کردبوو، ئەگەر بچنە پاڵ دەوڵەتی تازەی عێراق، ئەوا دەتوانن حکومەتێکی تایبەت بە خۆیان دابمەزرێنن. ئەو دوو دەوڵەتە ئامادەیی خۆیان پیشان دابوو کە پێشوازی لە نوێنەرانی کورد بکەن بۆ گفتوگۆ لەسەر جۆری دامەزراندنی ئەو حکومەتە و دیاریکردنی دەسەڵاتەکانی و شێوەی پێوەندیی سیاسی و ئابوورییان لەگەڵ حکومەتی ناوەندا. بەڵام دەوڵەتی عێراق هەر لە سەرەتای دامەزراندنییەوە تا وەرگرتنی بە ئەندام لە کۆمەڵەی نەتەوەکان پابەند نەبووە بەو بڕیارە نێودەوڵەتییانە.**

ڕێککەوتننامەی 11ی ئازاری 1970 کە دانی بە ئۆتۆنۆمی بۆ ناوچەیێك لە باشووری کوردستان نا، لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە پێشێلکرا. ئەو رژێمە دەستی کرد بە وێرانکردنی بەشێك لە گوندەکانی کوردستان و گواستنەوەی دانیشتووانیان بۆ کۆمەڵگا زۆرەملێیەکان. لەو ماوەدا نزیکەی چوارسەد هەزار کوردی فەیلی ڕەوانەی ئێران کرد، دواتر چەکی کیمیاوی لە شاری هەڵەبجە و چەند دەڤەرێکی دیکەی کوردستانی بەکارهێنا، لەگەڵ تاوانی ئەنفال بەدناو، کە بووە هۆی لەناوبردنی سەدان هەزار خەڵکی بێ گوناه.

پەسندکردنی بڕیاری ژمارە (688)ی نیسانی 1992 لەلایەن ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان، کە زیاتر بۆ پاراستنی گەلی کوردستان بوو، نەبووە ڕاگرتنی کردەوەکانی حکومەتی عێراق.

لە مانگی ئەیلوولی 1991دا حکومەتی عێراق دەزگاکانی لە (ناوچەی ئۆتۆنۆمی) کێشایەوە و ئابلۆقەی سەربازی و ئابووریشی خستە سەر. سەرکردایەتی سیاسیی کورد بڕیاری سازدانی هەڵبژاردنی دا بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانێکی تایبەت بەو ناوچەیە. لە 4ی تشرینی یەکەمی 1992دا ئەو پەرلەمانە سیستمی فیدراڵی وەك بنەمایەك بۆ دیاری کردنی پێوەندیی دەستووری لە نێوان هەرێمی کوردستان و حکومەتی ناوەند لە عێراق پەسندکرد. ئەو بڕیارە لەگەڵ بنەما نێودەوڵەتییەکاندا دەگونجێ، کە دان بە مافی گەلاندا دەنێن بۆ دیاریکردنی چارەنووسی خۆیان. گەلی کوردستان مافی ڕەوای خۆی بەکارهێنا لە دیاری کردنی شێوەی بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی خۆی بە دەستوورێکی تایبەت بە هەرێمی کوردستان. پاش پەسندکردنی دەستووری تازەی عێراق لە ساڵی 2005دا، ماددەی (120)ی ئەو دەستوورە دانی بەو مافەدا ناوە.

بۆ دەستەبەرکردنی دەسەڵاتە تایبەتییەکانی هەرێمی کوردستان و ڕێکخستنی پێوەندیی لە نێو دامەزراو و دەزگاکانی ئەو هەرێمە، ئەم دەستوورە لە لایەن گەلی کوردستانەوە پەسندکراوە}.

# دەروازەی یەکەم
# بنەما سەرەکییەکان

**ماددەی (1)**

**کوردستانی - عێراق هەرێمێکە لە نێو دەوڵەتی عێراقی فیدراڵیدا، سیستەمە سیاسیەکەی پەرلەمانی، کۆماری و دیموکراتیەو پشت بە فرەلایەنیی سیاسی و بنەمای لێکجیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان و دەستاودەستکردنی ئاشتیخوازانەی دەسەڵات لە ڕێگای هەڵبژاردنی گشتیی ڕاستەوخۆی نهێنی و دەوریەوە دەبەستێ.[1]**

**پێشنیاز:**

**{هەرێمی کوردستان، هەرێمێکە لەناو دەوڵەتی عێراقی یەکگرتوودا، کە سیستمە سیاسییەکەی کۆماری و پەرلەمانی و دیموکراتییە و لەسەر بنەمای فرەلایەنیی سیاسی و دەستاودەستکردنی ئاشتییانەی دەسەڵات و لە ڕێگەی هەڵبژاردنی گشتیی ڕاستەوخۆی نهێنی و بنەمای جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان، دامەزراوە}.**

**ماددەی (2)**

**یەکەم: کوردستانی – عێراق قەوارەیەکی جوگرافیی مێژووییە، پێکدێت لە پارێزگای دهۆك بە سنووری کارگێڕی[2] ئێستایەوەی ولە پارێزگاکانی کەرکووك و سلێمانی و هەولێر وقەزاکانی ئاکرێ و شێخان وسنجار و تلکێف و قەرەقۆش و ناحیەکانی زمارو بەعشیقە و ئاسکی کەلەك لە پارێزگای نەینەوا و هەردوو قەزای خانەقین و مەندەلی لە پارێزگای دیالە. ئەمانەش بە سنووری کارگێریی پێش ساڵی 1968یانەوە.**

**پێشنیاز:**

---

[1] **پرۆژەی دەستووری هەرێم، کە پەرلەمانی هەرێم لە 24ی حوزەیرانی 2009دا پەسندی کردووە، وەکو خۆی بلاّومانکردۆتەوە، هەرچەندە لە ڕووی زمانەوانییەوە هەڵەی تێدایە، بۆیە بەرپرس نین لەو هەڵانەی لێرەدا بەرچاو دەکەون.**

[2] **(کۆڕی زانیاری کورد) دەمێکە وشەی (کارگێڕی) بۆ (ادارة اعمال) و (بەڕێوەبەرایەتی) بۆ (ادارة) بەکارهێناوە، بۆیە (سنووری کارگێڕی پارێزگای..) بۆ (الحدود الاداریة لمحافظة..) دەبێ بکرێتە (سنووری بەڕێوەبەرایەتی پارێزگای..).**

**{ یەکەم: کوردستانی – عێراق لە ڕووی بەڕێوەبەرایەتییەوە پێکهاتووە لە پارێزگای دهۆك بە سنووری بەڕێوەبەرایەتیی ئێستای، لەگەڵ سنووری بەڕێوەبەرایەتیی پێش ساڵی 1968ی پارێزگاکانی کەرکووك و سلێمانی و هەولێر و قەزاکانی ئاکرێ و شێخان و شەنگال و تەلەعفەر و تلکێف و قەرەقۆش و ناحیەکانی زومار و باشیقە و ئاسکی کەڵەك لە پارێزگای نەینەوا، و قەزای خانەقین و ناحیەی مەندەلی لە پارێزگای دیالە و قەزای بەدرە و ناحیەی جەسسان لە پارێزگای واسیت}.**

**دووەم:** سنووورە سیاسیەکانی هەرێمی کوردستان – عێراق، بە پشت بەستن بە جێبەجێکردنی ماددەی (140)ی دەستووری فیدراڵییەوە، دیاردەکرێن.

**پێشنیاز:**

**{ئەم بڕگەیە گومان دەخاتە سەر سنووری هەرێمی کوردستان بەو شێوەی لە بڕگەی یەکەمی ئەم ماددەدا دیاری کراوە. پشت بەستن بە ماددەی (140) بۆ دیاری کردنی سنووری سیاسی هەرێمی کوردستان وا لێکدەدرێتەوە، کە ئەگەر ئەو ماددەیە بەو شێوەی کورد داوای جێبەجێ کردنی دەکات و بەشێك لەو ناوچانە نەخرێنە سەر سنووری هەرێمی کوردستان، دەبێ کورد قبووڵی بکات و دەست لە کوردستانییەتی ئەو ناوچانە هەڵبگرێ. جگە لەوەش، ئەو ماددەیە بۆ چارەسەرکردنی کێشەیەکی دیکە داڕێژراوە، کە نەهێشتنی شوێنەواری سیاسەتی بە عەرەبکردنی ئەو ناوچانەیە. ئەم بڕگەیە لە کۆبوونەوەی نائاسایی (لیژنەی دەستووری) لە 22ی ئابی 2006 خراوەتە سەر پرۆژەکە، لە پرۆژەکەی حوزەیرانی 2006دا نەبوو}.**

**سێیەم:**

نابێ هەرێمێکی نوێ لەنێو سنووری هەرێمی کوردستان، دابمەزرێندرێ.

**پێشنیاز:**

**{ئەم بڕگەش لە جێی خۆیدا نەهاتووە، چونکە لەناو هەرێمی وڵاتێکدا (هەرێمێکی) دیکە دروست ناکرێت، بەڵام دەکرێ (ناوچەیێکی ئۆتۆنۆم) هەبێ. بۆ نموونە، ناوچەی (کۆزۆڤۆ) تا سەربەخۆیی بەدەستهێنا، ناوچەیێکی ئۆتۆنۆم بوو لە کۆماری (سربیا) لە سەردەمی کۆماری یۆگسلافیا، پێش دابەشکردنی و دوای دابەشکردنیشی.**

**سەبارەت بە یەکلاییکردنەوەی دوارۆژی ناوچەی کەرکوك بە پێویستی دەزانم لێرە ئاماژەیەك بۆ ئەو پێشنیازە بکەم، کە لە هاوینی ساڵی 2009دا لەگەڵ شاندێکی**

**قانوونی سەر بە ( UN) لە عێراق گفتوگۆمان لەسەرکردووە. ئەو شاندە قانوونییە کە پێکهاتبوو لە (5) شارەزای قانوونی، سەردانی هەولێریان دەکرد بە مەبەستی چارەسەرکردنی پرسی کەرکوك. پێش سەردانی ئەو شاندەی UN ساڵی پێشتر و لە ماوەی جیاوازدا دوو شاندی حکومەتی ئەمریکی و بەریتانی هاتنە هەرێمی کوردستان (هەولێر) بۆ بیرو ڕاگۆڕینەوە سەبارەت بە چارەسەرکردنی دواڕۆژی ناوچەی کەرکوك. چاوپێکەوتن و گفتوگۆکە لەسەر داوای ئەوان بوو، پێشنیازەکەش بە کورتی بریتی بوو لەوەی ناوچەی کەرکووك، بە سنووری بەڕێوەبەرایەتیی پێش ساڵی 1977، بکرێتە (ناوچەیەکی ئۆتۆنۆم) لەناو هەرێمی کوردستان، بەڵام بە چەند مەرجێك، کە دوو ئەنجومەن بەناوی(ئەنجومەنی بڕیاردان ) و (ئەنجومەنی بەڕێوەبردن) دروست بکرێن. یەکەمیان ئەندامەکانی بە هەڵبژاردن لەلایەن دانیشتوانی ناوچەی کەرکوك دیاری بکرێن، ئەم ئەنجومەنەش سەرۆك و ئەندامانی (ئەنجومەنی ڕاپەراندن) دەستنیشان بکات، ئەو دوو ئەنجومەنە بەرپرس دەبن لە بەڕێوەبردنی کاروباری ناوخۆیی ناوچەکە. لەبەر ئەوەی لە ڕووی دەستوورییەوە ناوچەکە بەشێك دەبێ لە هەرێمی کوردستان، دانیشتوانی بەشداری لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی هەرێمی کوردستانیش دەکەن و ژمارەی نوێنەریان لەناو ئەو پەرلەمانەدا بەگوێرەی ژمارەیان لەسەر ئاستی هەرێمی کوردستان دەبێ. نوێنەرانی ئەو ناوچەیە بەشداریش لە حکومەتی هەرێم دەکەن هەر بەپێی ئەو ڕێژەیە. شاندەکەی UN چەند پرسیارێکی قانوونییان لێ کردم سەبارەت بە زەمانەتی مانەوەی ئەو ناوچەیە بەو شێوەیە. گوتم زەمانەت دوو جۆرن، یەکێکیان دەستووری، بەوەی لە هەردوو دەستووری عێراق و هەرێمی کوردستان دەقێکی دەستووری، کە پێشتر ڕێککەوتنی لەسەر بکرێ، لەناو ئەو دوو دەستوورە بچەسپێنرێ. زەمانەتی دووەم نێودەوڵەتی دەبێ، بە بەستنی کۆنفرانسێکی نێودەوڵەتی، کە نوێنەرانی چەند دەوڵەتێکی زلهێز و دەوڵەتانی ناوچەکە و هەردوو حکومەتی عێراق و هەرێمی کوردستان بەشداری تێدا بکەن. ئەو دوو زەمانەتە هەموو لایەنە پەیوەندیدارەکان دڵنیا دەکاتەوە کە دەستکاری لەو ڕێککەوتنە ناکرێت و ڕێگە لە دەوڵەتانی ناوچەکە دەگرێت دەست بخەنە ناو کاروباری ناوخۆی ناوچەی ئۆتۆنۆمی کەرکوك. هەمان ئەو پێشنیازەم بۆ بەشداربوونی ئەو کۆنفرانسە کە لە مانگی ئایاری**

**سالّی 2010دا له پاریس لەلایـەن (ئینـستیتوی کوردی لـه پـاریس) ڕێکخرابـوو بـۆ چارەسەرکردنی پرسی کەرکوك، ڕوونکردەوە.}.**[1]

**ماددەی (3)**

**یەکـەم: گـەل سەرچـاوەی دەسـەلاّتەو ڕەوا بوونیـەتی، کـە لـە ڕێگـای دامودەزگـا دەستووریەکانیەوە پیادەی دەکات و دەستوورو یاساکانی هەرێمی کوردسـتان سـەروەریو بالاّدەسـتیان بەسـەر هـەموو ئـەو یاسـایانەدا هەیـە کـە لەلایـەن حکومـەتی عێراقـەوە دەردەچن و بەدەرن لە دەسەلاّتە تایبەتیەکانی (حصری) دامودەزگا فیدراڵیـەکان کـە لـە ماددەی (110)ی دەستووری کۆماری عێراقی فیدراڵیدا هاتوون.**[2]

**تێبینی: { قانوون لەلایـەن حکومـەتی عێراقـەوە دەرناچـن، بـەڵکو ئەنجومـەنی نوێنەرانی عێراق پەسندیان دەکات}.**

**پێشنیاز:**

**{یەکەم: گەل سەرچاوەی دەسەلاّتەکانە و بنەمای ڕەوایەتییانە، لە ڕێگای دامەزراوە دەستوورییەکانەوە پیادەی دەکات، دەستووری هەرێمی کوردستان و قانوونەکانی لەو قانوونانـەی پەرلـەمانی عێـراق پەسـندیان دەکـات سـەروەرترن، مەگـەر لـەو بـوارە**

---

[1] بۆ زانیاریی زیاتر، تەماشای ئەو نووسینەم بکە کە لە ژێـر ناونیـشانی: گەڕاندنـەوەی ناوچـەی کـەرکووك وەکـو ناوچـەیێکی ئۆتۆنـۆم بـۆ سـەر هـەرێمی کوردسـتان بکـە، کـە لـە 9ی ئـەیلوولی 2009 لـە ڕۆژنامـەی (ئاوێنـە) بلاّوکراوەتەوە. لەو کۆنفرانسەی کە (ئینستیتوی کوردی لە پاریس) لە 14ی مایسی 2010دا سازی کردبـوو بـۆ چارەسـەرکردنی کێـشەی کـەرکوك و جێبـەجێ کردنـی مـاددەی (140)، ئـەو پێـشنیازەم جـارێکی تـر بـۆ بەشداربووانی ئەو کۆنفرانسە ڕوونکردەوە، کە پارێزگار و نوێنەرانی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك، بـە کـورد و تورکمانی شیعە و پارێزگاری ئێستای کەرکوك، د. نەجمەدین کەریم و نوێنەرانی لایەنە سیاسییەکانی کوردستان و نوێنەری حکومەتی فەڕەنسی و چەند کەسایەتییێکی فەڕەنسیی دۆستی کورد ئامادەی بوون.

[2] وشەی (یاسا) وشەییێکی مەغۆلی تورکییە، لە تورکیا بـەکاردێت و بـۆ دەسـتووریش (ئەنـە یاسـا) یـانی (دایکـی قانوون) بەکاردێنن. وشەی (قانوون) وشەییێکی یۆنانیی کۆنە، لە (کانۆنیمۆس)ەوە هاتووە. بۆ یەکەم جار تۆفیق وەهبی بەگ وشەی (یاسا)ی بەکارهێناوە، هەر بە هۆی ئەویشەوە کەوتووەتە ناو زمانەکەمان، بەلاّم پەشیمان بوو لە بەکارهێنانی و دەیگوت کوردیش وەکو عەرەب و فارس دەتوانن بەکاری بێنن. تەماشای پێـشەکی (فەرهـەنگی قانوونی) عەرەبی – کوردی – فەڕەنسی – ئینگلیزی) بکە، چاپی پێنجـەم، سـالّی 2010، کـە لەلایـەن هـەردوو وەزارەتی داد و ڕۆشنبیری و لاوان چاپکراوە، ل 4، چاپخانەی (ڕۆژهەلاّت)، هەولێر.

**تایبەتییانەدا نەبێ کە بە دەسەڵاتی حکومەتی عێراق لە ماددەی 110ی دەستووری عێراقدا دیاری کراون.}**

**دووەم:** یاسای فیدراڵ لەسەروەری و باڵا دەستیی دەستووری هەرێمی کوردستان و یاساکانی و ئەو دەسەڵاتانەی کەم ناکاتەوە کە لە ماددەی (115) و برگەی دووەمی ماددەی (121)ی دەستووری فیدراڵیدا هاتوون، ئەگەر کاروبارێکی لە خۆ گرت کە دەکەوتنە چوارچێوەی ئەو دەسەڵاتە تایبەتیانەی لە ماددەی (110)ی دەستووری فیدراڵیدا بە دام و دەزگا فیدراڵیەکان دراون و کاروبارێکی دیکەشی لە خۆگرت کە بەدەربوون لەو چوارچێوەیە.

**پێشنیاز:**

**{دووەم: پەرلەمانی هەرێمی کوردستان دەتوانێ ئەو قانوونانەی لە لایەن ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقەوە دەردەچن، گەر لە بەرژەوەندیی گەلی کوردستان بن، پەسندیان بکات، هەتا ئەگەر لە دەسەڵاتە دیاریکراوەکانی ماددەی (110)ی دەستووری عێراقیش نەبن.**

**سێیەم: ئەو قانوونە فیدراڵییانەی لە لایەن ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقەوە دەردەچن، لە هەرێمی کوردستان کاریان پێ ناکرێ، تا پەرلەمانی هەرێمی کوردستان پەسندیان نەکات.}**

**ماددەی (4)**

پەرلەمانی کوردستان بۆی هەیە هەر یاسایەکی فیدڕاڵی لە هەرێمدا بخاتە کار کە بەدەربێ لە تایبەتمەندیی (حصری) دەسەڵاتەکانی فیدراڵی کە لە ماددەی (110)ی دەستووری کۆماری عێراقی فیدراڵیدا هاتوون.

**پێشنیاز:**

**{ ئەو قانوونانەی لە لایەن ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقەوە دەردەچن، ئەگەر لە دەسەڵاتە دیاریکراوەکانی ماددەی 110ی دەستووری عێراقیش نەبن، پەرلەمانی هەرێمی کوردستان دەتوانێ پەسەندیان بکات بۆ ئەوەی لە هەرێمی کوردستان کاریان پێ بکرێت، ئەگەر لە بەرژەوەندیی گەلی کوردستان بن}.**

**ئەگەر بڕگەی (سێ) لە (ماددەی سێی) ئەم پرۆژەیە، بەو شێوەی پێشتر پێشنیاز کراوە پەسند بکرێت، ئەم ماددەیە زیادە دەبێ لەو بڕگەدا پێشنیازکراوە کە ئەو قانوونە فیدراڵییانەی لە لایەن ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقەوە دەردەچن، لە هەرێمی کوردستان کاریان پێ ناکرێت، تا پەرلەمانی هەرێمی کوردستان پەسندیان نەکات.}.**

**ماددەی (5)**

گەلی هەرێمی کوردستان پێك هاتووە لە کورد، تورکمان، عەرەب، کلدان، سریان ئاشووری، ئەرمەن و هاووڵاتیانی دیکەی هەرێمی کوردستان پێکهاتوون.

**ماددەی (6)**

ئەم دەستوورە دان دەنێت بە ناسنامەی ئیسلامی زۆرینەی گەلی هەرێمی کوردستان و ڕێزی لێ دەگرێ، و دان بە تەواوی مافە ئایینیەکانی مەسیحی و ئێزدیەکان و ئەوانی دیکەدا دەنێ و سەربەستی بیروباوەڕ وبەڕێوەبردنی ڕێو ڕەسم و داب و نەریتی ئایینی لە هەرێمدا بۆ هەموو کەسێك دابین دەکات، بنەماکانی شەریعەتی ئیسلام سەرچاوەیەکی یاسادانانن و نابێ:

**یەکەم:** یاسایەك دابنرێت ناکۆك بێت لەگەڵ حوکمە نەگۆڕەکانی ئیسلام.

**دووەم:** یاسایەك دابنرێت ناکۆك بێت لەگەڵ بنەماکانی دیموکراسی.

**سێیەم:** یاسایەك دابنرێت ناکۆك بێت لەگەڵ ئەو ماف و ئازادیە بنەڕەتیانەی لەم دەستوورەدا هاتوون.

**ماددەی (7)**

گەلی کوردستان – عێراق مافی دیاریکردنی چارەنووسی خۆی هەیە بەویست و ئازادانەی خۆی ئەوەی هەڵبژاردووە کە کوردستان هەرێمێکی فیدراڵی بێ لە چوارچێوەی عێراقدا مادام عێراق پابەند بێ بە سیستمی فیدراڵی، دیموکراتی، پەرلەمانی، فرەلایەنی، مافەکانی تاك و کۆی مرۆڤەوە، بەوجۆرەی کە لە دەقی دەستووری فیدراڵدا هاتووە.

**پێشنیاز دەکەم ئەم ماددەیە دابەش بکرێت بەسەر سێ بڕگەدا:**

**{ 1- گەلی کوردستان - عێراق مافی دیاریکردنی چارەنووسی خۆی  هەیە.**
**2. گەلی کوردستان - عێراق لەگەڵ گەلی عەرەبی عێراقدا بە ویست و ئارەزووی خۆی دەوڵەتێکی فیدراڵی دامەزراندووە، سیستمەکەی دیموکراتی و پەرلەمانی و فرەلایەنییە و لەسەر بنەمای رێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ دامەزراوە.**
**3. مانەوەی گەلی کوردستان - عێراق لەم دەوڵەتە یەکگرتووەدا بەندە بە ڕەچاوکردنی بنەما سەرەکییەکانی دەستووری عێراق، بەتایبەتی فیدرالیزم و سیستمی پەرلەمانی و دیموکراتی و رێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ، لەگەڵ جێبەجێکردنی ماددەی 140 لە دەستووری عێراق و نەهێشتنی شوێنەواری سیاسەتی گۆڕینی باری دیمۆگرافی لەو ناوچانەی کە ئەو ماددەیە دەستنیشانی کردوون}.**

**ماددەی (8)**

**یەکەم:** ئەو پەیماننامە و ڕێککەوتنامە نێودەوڵەتیانەی، کە حکومەتی فیدراڵ لەگەڵ هەر دەوڵەتێك، یان لایەنێکی بیانیدا مۆریان دەکاو پێوەندیان بە پێگە، یان بە مافەکانی هەرێمی کوردستانەوە هەیە، کاریان پێدەکرێت لە هەرێمدا، ئەگەر پەرلەمانی کوردستان – عێراق بە زۆرینەی ڕەهای ژمارەی ئەندامانی رەزامەندیان لەسەر بدات.

**دووەم:** هەتا پەرلەمانی کوردستان – عێراق بە زۆرینەی ڕەهای ژمارەی ئەندامانی رەزامەندی نەدات، کار بەو پەیماننامەو ڕێککەوتنامانە ناکرێت بەرامبەر بە هەرێمی کوردستان کە حکومەتی فیدراڵ لەگەڵ دەوڵەتێکی بیانی مۆریان دەکات ئەگەر هەندێ پرس لە خۆ بگرن کە لە دەرەوەی ئەو دەسەڵاتە (حصریە) تایبەتیانە بن کە بەپێی ماددەی (110) لە دەستووری فیدراڵی، بۆ حکومەتی فیدراڵ دیارکراون.

**پێشنیاز:**

**(ئەگەر بڕگەی (سێیەم)ی (ماددەی سێی) ئەم پرۆژەیە بەو شێوەی پێشتر پێشنیازم کردووە بخرێتە سەر پرۆژەکە، بەوەی: {ئەو قانوونە فیدراڵییانەی لە لایەن ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقەوە دەردەچن لە هەرێمی کوردستان کاریان پێ نەکرێت، تا پەرلەمانی هەرێمی کوردستان پەسندیان دەکات}، ئەوا پێویست بەم ماددەیە ناکات.**

**سێیەم:** هەرێمی کوردستان مافی ئەوەی هەیە ڕێکەوتننامە لەگەڵ دەوڵەتە بیانیەکان، یان هەرێمەکانی نێویانەوە مۆر بکات سەبارەت بەو پرسانەی ناکەونە نێو ئەو دەسەڵاتە (حصریە) تایبەتیانەی کە بە پێی ماددەی (110) لە دەستووری فیدراڵیدا، بۆ حکومەتی فیدراڵی دیارکراون.

**{سێیەم: لە چوارچێوەی دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان، کە لە دەرەوەی دەسەڵاتە دیاریکراوەکـانی حکومـەتی یەکگرتوودایـە، هـەرێم دەتـوانێ ڕێکەوتننامـە لەگـەڵ حکومەتەکانی هەرێمی دەوڵەتانی بێگانەدا ببەستێت}.**

**چوارەم:** ئەو ڕێککەوتننامانەی لە نێوان هەرێمی کوردستان و دەوڵەتانی بیانی، یان هەرێمـەکانی نێویانـەوە مـۆر دەکـرێن دەخرێنـە بـەر چـاوی حکومـەتی فیـدراڵ بـۆ پەسەندکردن و ئەگەر حکومـەتی فیـدراڵ لەبـەر چـەند هۆیـەکی دەسـتووری و یاسـایی ڕەزامەندی لەسەر نەدان جێبەجێ ناکرێن.

**ماددەی (9)**

هەرێم مافێکی بنچینەیی و دەستووری بەرامبەر بە دەسـەڵاتە فیدرالیەکانـدا هەیـە لە:

**یەکەم:** بەشێکی دادوەرانە لە داهاتە فیدرالیەکاندا، بە بەخشش و یارمەتی و قەرزە نێو دەوڵەتیەکانەوە لەسەر بنەمای هاوبەشانیی ڕێژەیی دانیـشتووان و لەبەرچـاوگرتنی ئەو بارەی تووشـی کوردسـتان – عێـراق بـووە لـە سیاسـەتی کۆمـەڵکوژی و سـووتاندن و وێرانکردن و بێبەشکردنی گەلەکەی لە مـافی شـیاوی خـۆی بـە درێـژایی فـەرمانڕەوایی ڕژێمـەکانی پێـشوو، ئەمـەش بـەپێی هـەردوو مـاددەی (106 و 112)ی دەسـتووری فیدراڵ.

**دووەم:** بەشداریکردنێکی دادپەروەرانە لە بەڕێوەبردنی دامودەزگا جۆراوجۆرەکـانی دەوڵـەتی فیـدراڵ و نێـردە (بعثـات) و کورسـیەکانی خوێنـدن (الزمـالات الدراسـیە) و شاندەکانی و کۆنفرانسە هەرێمی و نێودەوڵەتیەکاندا بە شێوەیەکی گونجاو و هاوشـان و سپاردنی پلەکانی فەرمانبەریی لـە فەرمانگـە فیدراڵیـەکان لـە هـەرێمی کوردسـتاندا بـە هاوڵاتیانی خۆی بەپێی ماددەی (105) لە دەستووری فیدراڵدا.

**ماددەی (10)**

شاری هەولێر، پایتەختی هـەرێمی کوردسـتانە و پەرلـەمانی هـەرێمیش بـۆی هەیـە شـارێکی دیکـەی کوردسـتان بکاتـە پایتـەخت بـە زۆرینـەی دوو لەسـەر سـێی ژمـارەی ئەندامانی.

**ماددەی (11)**

**یەکەم:** هەرێمی کوردستان - عێراق ئاڵایەکی تایبەتی هەیە، لەتەك ئاڵای فیدراڵیدا هەڵدەدرێ، هەروەها دروشم و سروودی نیشتمانی و جەژنی نەتەوایەتیی خۆی (نەورۆز)یشی هەیەو ئەمەش بە یاسا رێك دەخرێ.

**دووەم:** ئاڵاکە پێك دێت لە رەنگی سوور، ئینجا سپی ئینجا سەوز و خۆرێکیش بە رەنگی زەرد دەکەوێتە ناوەڕاستیەوە کە بیست و یەك تیشکیی لێوە دەردەچن و بە یاسایەك ئەندازەکانی دیاردەکرێن و مانای پێکهاتەکانی ڕووندەکرێتەوە.[1]

**سێیەم:** پشووە فەرمیەکان و نیشانە و مێدالیاکان بە یاسایەك رێکدەخرێن.

**ماددەی (12)**

هەرێمی کوردستان بەپێی برگەی (پێنجەم) لە ماددەی (121)ی دەستووری فیدراڵی، هێزی پێشمەرگەی بەرگریکاری هەیە بۆ پاراستنی هەرێم، کە پێکهاتەو

---

[1] سەبارەت بەو"بیست و یەك تیشکە"ی لە پرۆژەکەدا بۆ ئەو ئاڵایە دیاری کراوە، مامۆستا محەمەدی حەمەی باقی لە نامەیەکدا بۆی ناردووم نووسیویەتی: " نازانم دیاریکردنی ئەو ژمارەی (21) پرشنگە چۆن بۆ ئەم خۆرە دانراوە؟ ئەگەر هەڵبژاردنی (خۆر) وەك سیمبول و ئاماژەیەك بێت بۆ (ڕووناکی)، ئەوا دەبێ ئاوڕ لەو پێشینە مێژووییە بدەینەوە، کە گەلانی ئاریایی لە ڕێگەی ئایینە بەرودواکانی وەك (میترائی)، (هوری واتە خۆری)، (زەرتوشی)، (بودایی)، (ئیزەدی) و (ئەهلی هەق) و...هتد، ڕێزی زۆریان بۆ (خۆر) هەبووە و هەندێ لەم ئایینانەش، لە هەندێ سەردەمدا (خۆر)یان پەرستووە و دێرینەی ئەم بروایەش بە هەموویانەوە، لە بنەمای خۆرهەڵاتی ئەم گۆی زەمینەوە سەری هەڵداوە، نەك لە بەشی خۆرئاوای گۆی زەوی، کە دواتر حەزرەتی (مەسیح) لە (خۆرئاوا) سەری هەڵداو هەر لە وێشەوە مێژووی (زایین) دەستی پێکردووە و ئێستا ئەم مێژووی زایینییە، لە زۆرینەی ناوچەکانی خۆرهەڵاتدا – بە کوردستانی باشووریشەوە – پەیڕەو دەکرێ و زۆر لە بۆنە نەتەوەییەکانی کوردیش، سەرەڕای ئەوەی بە گوێرەی ساڵنامەی کوردی، یان ڕوونتر: ئاریایی، بنیات نراون، بەڵام دیسانیش لەپاڵ مێژووی کوردیدا، (بۆ نموونە) مێژووی (21) پرشنگی (خۆر)ەکەی ناوەڕاستی ئاڵای کوردستان، مەبەست و هێمایە بۆ: بۆنەی نەورۆزی کوردی، کە وەك وترا: ڕێکەوتی (21)ی مانگی مارتی زایینی دەکات، ئاخۆ پێوەندیی نێوان مێژووی (21)ی (زایین)ی خۆرئاوا و (1)ی نەورۆزی سەرساڵی تازەی گەلانی (ئاریایی)ی خۆرهەڵات چییە؟ خۆ ئەگەر ژمارەی (21)ی پرشنگی خۆرەکەی ئاڵاکەی کوردستان هێمایە بۆ (21)ی مارت، ئەو بەڕێزانەی ئەم لێکدانەوەیان پێکهێناوە، پشت بە کامە زانیاری و مێژووی پێشینەی کلتووری و ڕووناکبیریی کوردیان بەستووە و ئاگاداری و زانیاریی مێژووی گەلانی ئاریایی و کوردیان چۆن چۆنی خوێندووەتەوە؟...."، بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر ئاڵای کوردستان لە ڕووی مێژووییەوە، تەماشای نووسینی د. ئازاد عوبێد ساڵح بکە بە ناونیشانی: مێژووی ئاڵای کوردستان، گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی، ژمارە (23)، ساڵی 2012، ل 233.

**ئەرکەکانی بە یاسایەك ڕێکدەخرێن و نابێ میلیشیای چەکدار لە دەرەوەی چوارچێوەی یاسا پێکبهێنرێن.**

**پێشنیاز:**

**{یەکەم: هەرێمی کوردستان هێزی پێشمەرگەی هەیە، کە هێزێکی بەرگرییە و سنوورەکانی هەرێم دەپارێزێت، پەرلەمانی هەرێم ئەرك و پێکهاتە و شێوەی ڕێکخستنی بە قانوون دیاری دەکات.**

**دووەم: لە هەرێمی کوردستان میلیشیای چەکدار لە دەرەوەی قانووندا نابێ و دانامەزرێت.}**

**ماددەی (13)**

**ڕێگە نادرێ بە دانانی یان هەموارکردنی یان لێخۆشبوونی هیچ ڕەسم یان باجێك لە هەرێمی کوردستاندا بەبێ ڕەزامەندیی پەرلەمانی کوردستان و پەسندکردنی بە یاسایەك.**

**ماددەی (14)**

**یەکەم: کوردی و عەرەبی دوو زمانی فەرمیی هەرێمی کوردستانن و ئەم دەستوورە مافی هاوولاتییانی هەرێمی کوردستان دەستەبەر دەکات لە فێرکردنی منداڵەکانیان لە دام و دەزگا فێرکاریەکانی حکومەتیدا بە پێی مەرج و ڕێککاریەکانی پەروەردەیی بە زمانی زگماکی خۆیان ، ئەمەش زمانەکانی تورکمانی و سریانی و ئەرمەنیش دەگرێتەوە.**

**دووەم: زمانی تورکمانی و سریانی دوو زمانی ڕەسمین لەتەك زمانی کوردیـو عەرەبییەوە، لەو یەکە کارگێڕییانەدا کە ئەوانەی بەو زمانانە دەدوێن، زۆرینەی دانیشتووان پێك دێنن، ئەمەش بە یاسایەك ڕێکدەخرێ.**

**سێیەم: لە هەرێمی کوردستان کار بە حوکمەکانی ماددەی (4)ی دەستووری فیدراڵی دەکرێت لەبارەی زمانی فەرمیەوە لە هەر جێیەك بواری یاسایی هەبێت بۆ جێبەجێکردنی.**

**ماددەی (15)**

**هەرێمی کوردستان پشت بە سیستمی ئابووری و بازاری کێبرکێیی ڕەوا دەبەستێ، لەگەڵ هاندان و گرتنەبەری پەرەپێدانی ئابووری لەسەر بنەمای نوێ و بەرهێنان، بەهەر دوو ڕووی گشتی و تایبەتیەکەیەوە، فۆرخکردنی ئازاد لە هەرێمی کوردستاندا پەیڕەو دەکرێت و ڕێگا بە چەوسانەوە و فۆرخکردنیش (احتكار) بە یاسا نەبێ ڕێگەی پێ نادرێ.**

**ماددەی (16)**

**هەموو دەسەڵاتەکانی هەرێم، بە پێی بەرپرسیارێتیان بەرامبەر بە نەتەوەکانی ئێستاو دوارۆژەوە، ئەرکی پاراستنی ژینگە و پێداویستیە سەرەکیەکانی ژیان و ژینگەی سروشتی و ژینگەی مرۆڤیان لە هەرێمی کوردستاندا لەسەر شانە، یاساش چۆنیەتیی دروستکردنی ناوچە پاوانکراوەکانی دەشت و دەوەرو گیانلەبەرەکان و ڕووەکە سروشتیەکان چۆڵەوانیەکان وهێشتنەوەیان بە شێوەی سروشتیی خۆیان ورێگە نەدان بە دروستکردنی خانووبەرە و هەرچەشنە چالاکییەکی فیزیکی دیکە تیایاندا، ڕێك دەخات.**

**ماددەی (17)**

**یەکەم: داهات و سەرچاوە گشتیەکانی سامانی سروشتی و ئاوی ژێر زەوی و کانە دەرنەهێنراوەکان و ئاوی سەر زەوی و کانە بەرد و کانگاکان، سامانی گشتین و دەرهێنان و بەکارهێنانیان و بەڕێوەردن و مەرجەکانی ڕەفتار لەسەرکردنیان بە یاسایەك ڕێك دەخرێن کە بۆ بەرژەوەندی نەوەکانی ئێستا و دوا ڕۆژ پارێزگاریان لێ بکا.**

**دووەم: زەوی و سامانە گشتیەکانی هەرێم مولکی گەلی کوردستانی – عێراقن و چۆنیەتی رەفتار لەسەر کردن و بەکارهێنانیان بە یاسایەك ڕێك دەخرێ.**

**پێشنیاز:**

**{یەکەم: سامانی گشتیی هەرێمی کوردستان، بەتایبەتی سامانی سروشتی وەك زەوی و دارستان و ئاوی سەرزەمین و ژێرزەمین و کانزاکانی ژێر خاکەکەی، موڵکی خەڵکی کوردستانە.**

**دووەم: پاراستن و شێوەی بەڕێوەبردن و دەست هەڵگرتن لە بەشێکیان بە قانوون دیاری دەکرێت، بە مەرجێك ڕەچاوی پاراستنی بەرژەوەندیی نەوەکانی ئێستا و دوارِۆژیش بکرێت.**

**سێیەم: پاراستنی سامانی هەرێمی کوردستان و ئاگاداریکردنیان ئەرکی حکومەت و خەڵکی هەرێمە}.**

## دەروازەی دووەم

## مافە سەرەکیەکان

## بەشی یەکەم

## مافەکانی شارستانی و سیاسیەکان

**ماددەی (18) پابەندبوون و جێبەجێکردن:**

**یەکەم:** دەسەڵاتەکانی یاسادانان و جێبەجێکردن و دادوەریی هەرێمی کوردستان پابەند دەبن بەو مافە سەرەکیانەی کە لەم دەستوورەدا هاتوون وەك یاسایەکی سەرەکی، کە دەبێ پیادە بکرێن و جێبەجێبکرێن، وەك مافە بنەڕەتیەکانی هاوڵاتیانی هەرێم.

**دووەم:** ئەو دەق و حوکمانەی تایبەت بەو مافە سەرەکیانەی لەم دەستوورەدا هاتوون، هەرکاتێ جێبەجێ کردنیان لە توانادا هەبێ، کەسی سروشتی و مەعنەوی دەبێ پابەندبن پێیانەوە، بە لەبەرچاوگرتنی سروشتی مافەکە و سروشتی ئەو ئەرکەی مافەکە دەی سەپێنێ.

**سێیەم:** نابێ لە دژ هیچ کەسێك شێوازەکانی ئازاری جەستەیی، یان دەروونی ئەو مافە سەرەکیانەی بۆ کەسی سروشتی هاتوون لەم دەستوورەدا لەسەر کەسی مەعنەویش جێبەجێ دەبن لە هەرێمی کوردستاندا ئەگەر سروشتەکەی بۆ جێبەجێکردن بگونجێ.

**ماددەی (19) کەرامەت و ژیان و ئازادی:**

**یەکەم:** کەرامەتی ئادەمیزاد پارێزراوەو رێزلێگرتن و پاراستنی ئەرکی هەموو دەسەڵاتەکانی هەرێمە.

**دووەم:** هەموو کەس مافی ژیان و ئازادیی هەیە و بە یاسا نەبێ نابێ هیچ کەس لێیان بێبەش بکرێ یان لێی بەرتەسك بکرێتەوە.

**سێیەم:** نابێ لە دژ هیچ کەسێك شێوازەکانی ئازاری جەستەیی، یان دەروونی بەکاربهێنرێن، بە شێوەیەکی نامرۆڤانە رەفتاری لەگەڵدا بکرێ، سووکایەتی پێ بکرێ، یان بەبێ رەزامەندی ئازادانەی خۆی تاپکردنەوەی پزیشکی یان زانستی و هی جیکەی لەسەر ئەنجام بدرێ. پشت بە هیچ دانپێدانانێکیش نابەسترێ کە بە زۆر، بە ئازاردان، بە هەڕەشە یان بە ترساندنوەرگیرابێ، هەر کەسێکیش تووشی ئازاردان یان رەفتارێکی توندوتیژی، یان سووکایەتی پێکردن بووبێ، مافی خۆیەتی قەرەبووی ئەو زیانە جەستەیی و دەروونیانەی بۆ بکرێتەوە کە تووشی هاتوون.

**چوارەم:** لە چوارچێوەی ئەو خزمەتە گشتییەدا نەبێ کە بە پێی یاسا لەسەر هەمووان جێبەجێ دەکرێ، نابێ هیچ کەس ناچار بکرێ کارێکی بێگاری بکات.

پێنجەم: کاری بێگاری بەسەر کەسدا ناسەپێندرێ تەنها بە بڕیارێکی دادوەری نەبێ کە لە کاتی سزاداندا دیایدەکرێت.

**شەشەم:** هەموو کەس مافی ئاسایشی کەسیی (شەخسی) خۆی هەیە.

**حەوتەم:** هەموو کەسێك مافی ئەوەی هەیە رێز لە ژیانی تایبەتی و خێزانی و ناومالْ و هەموو پێوەندپێوەکردنەکانی بگیرێ. خانوو و مالْ و هاوشێوەیان رێزیان هەیەو نابێ پێشێل بکرێن. بە پێی یاساو بە فەرمانێکی دادوەری نەبێ کەس بچێتە نێویانەوە، پشکندرێن یان بخرێنە ژێر چاودێریەوە. هەروەها پشکنینی هەموو کەسێك یان شتوومەکەکانیشی بەبێ هۆیەکی یاسایی قەدەغەیە.

**پێشنیاز:**

**{مالْ و جێگای ژیان و ئەو شوێنانەی هاوشێوەی ئەون، رێزیان لێ دەگیرێ، پێشێلکردنیان، چوونەناویان، پشکنینیان، یان چاودێریکردنیان کارێکی ناقانوونییە ، مەگەر لەو حالەتانەدا، کە قانوون دیاری کردووون}.**

**هەشتەم:** هەموو کەس مافی هاوسەرگیری و پێکهێنانی خێزانی هەیە و گرێبەستی **(ڕێکەوتنی)** هاوسەرگیری بە زۆری و بەبێ ڕەزامەندیی تەواوی هەردوو لا ئەنجام نادرێ[1].

## دەروازەی سێیەم
## دەسەڵاتەکانی هەرێمی کوردستان - عێراق

**ماددەی (39)**

دەسەڵاتەکانی هەرێمی کوردستان - عێراق پێکدێن لە:

یەکەم: دەسەڵاتی یاسادانان **(قانووندانان)**

دووەم: دەسەڵاتی جێبەجێکردن **(ڕاپەڕاندن )**.

سێیەم: دەسەڵاتی دادوەری.

## بەشی یەکەم
## پەرلەمانی کوردستان _ عێراق
## {دەسەڵاتی قانووندانان،
## پەرلەمانی هەرێمی کوردستان}

**ماددەی (40)**

پەرلەمانی کوردستان – عێراق دەسەڵاتی یاسادانان و سەرچاوەی بڕیاردانە لەسەر پرسە چارەنووسسازەکانی گەلی هەرێمی کوردستان و ئەندامەکانی لە دەنگدانێکی گشتیی ئازاد و ڕاستەوخۆی نهێنیدا هەڵدەبژێردرێن.

**پێشنیاز:**

---

[1] **(تێبینییەکی تایبەتیم لەسەر خاڵەکانی دواتری ئەم ماددەیە و ماددەکانی دیکەی پرۆژەکە، تا کۆتایی ماددەی (سی و هەشت) نییە بۆیە ئاماژەم بۆ نەکردوون. بەڵام لە ڕووی داڕشتنەوە پێویستە تەماشابکرێنەوە).**

**{ پەرلەمانی هەرێمی کوردستان دەسەڵاتی قانووندانان و مەرجعی بڕیاردانە لەسەر پرسە چارەنووس سازەکانی هەرێمی کوردستان، ئەندامەکانی بە دەنگدانی گشتی و نهێنی راستەوخۆ لەلایەن گەلی هەرێمی کوردستانەوە هەڵدەبژێردرێن}.**

**ماددەی (41)**

**یەکەم:** شێوەی هەڵبژاردنی ئەندامانی پەرلەمانی کوردستان وچۆنیەتی و کاتی ئەنجامدانی و ڕێژەی نوێنەرایەتی تیادا بەپێی یاسا دیاردەکرێن.

**پێشنیاز:**

**{یەکەم: شێوەی هەڵبژاردنی ئەندامانی پەرلەمانی هەرێمی کوردستان و چۆنێتی بەڕێوەچوونی و دیاریکردنی کاتەکەی و ڕێژەی نوێنەرایەتی لەو پەرلەمانە و مەرجەکان و ئەندامبوون تێیدا، بەپێی قانوون دیاری دەکرێن}.**

**دووەم:** لە سستەمی هەڵبژاردنی ئەندامانـدا نوێنەرایەتی دادپەروەرانەی پێکهاتەکانی گەلی کوردستان و دەستەبەرکردنی ڕێژەیەك کە لە (30٪)ی کورسیەکانی پەرلەمانی کوردستان – عێراق کەمتر نەبێ، بۆ ژنان لەبەرچاو دەگرێ.

**{دووەم: لە پێکهاتەی پەرلەماندا نوێنەرایەتی دادپەروەرانە بۆ نەتەوەکانی هەرێمی کوردستان ڕەچاودەکرێت، لەگەڵ دەستەبەرکردنی ڕێژەی لە (30٪)ی لە کورسییەکانی پەرلەمان بۆ ژنان}.**

**سێیەم:** ئەندامانی پەرلەمان نوێنەری گەلی کوردستان – عێراقن، بە هەموو پێکهاتەکانیانەوە، بێ لەبەرچاوگرتنی پێوەندیی سیاسی، نەتەوەیی، ئایینی، یان ناوچەی هەڵبژاردنیانەوە.

**{سێیەم: ئەندامی پەرلەمان نوێنەرایەتی گەلی کوردستانی - عێراق بە هەموو پێکهاتەی نەتەوەیی و سیاسی و ئاینییەوە دەکات، بێ ڕەچاوکردنی ئینتما یان ئەو ناوچەی نوێنەرایەتی دەکات.}**

**ماددەی (42)**

**یەکەم:** خولی هەڵبژاردنی پەرلەمان چوار ساڵە، کە لە رۆژی یەکەم کۆبوونەوەیەوە دەست پێدەکات.

**دووەم:** پەرلەمان لەسەر بانگهێشتی سەرۆکی هەرێمی کوردستان، لە ماوەی پازدە ڕۆژی دوای ڕاگەیاندنی دوائاکامەکانی هەڵبژاردنەوە کۆدەبێتەوە، و ئەگەر هات و بانگهێشت نەکرا بۆ کۆبوونەوەی دەرنەچوو، هەر خۆی سەعات دوازدەی نیوەڕۆی ڕۆژی دوایتەواوبوونی ئەو ماوەیە کۆدەبێتەوە.

**{دووەم: پەرلەمان لەسەر بانگهێشتی سەرۆکی هەرێمی کوردستان لە ماوەی پانزە ڕۆژ، لە ڕۆژی پاش ڕاگەیاندنی دوا ئەنجامەکانی هەڵبژاردن کۆدەبێتەوە، ئەگەر لەو ماوەدا داوای کۆبوونەوەی لێ نەکرا، لە کاتژمێری دوانزەی نیوەڕۆی ڕۆژی پاشتر خۆی کۆدەبێتەوە}.**

**ماددەی (43)**

**{پەرلەمان یەکەم کۆبوونەوەی بە سەرۆکایەتی بە تەمەنترین ئەندامی دەبەستێت بۆ هەڵبژاردنی سەرۆك و جێگری سەرۆك و سکرتێر، بە دەنگدانی نهێنی}.**

**ماددەی (44)**

ئەندامی پەرلەمان پێش دەست بەکاربوونی ئەم سوێندەی خوارەوە دەخوات:

بەخودای گەورە سوێند دەخۆم کە بەرژەوەندیی گەلی هەرێمی کوردستان و یەکێتی و کەرامەت و ماف و ئازادییەکانی هاووڵاتییان و سامانی گشتی بپارێزم و پابەندی حوکمەکانی دەستوور بم و ئەرکی ئەندامیەتی بە ڕاستی و دڵسۆزییەوە ئەجام بدەم.

**ماددەی (45)**

ئەندامی پەرلەمان، کە سوێندی دەستووری خوارد، بە دەست کێشایەوە لە فەرمانەکەی خۆی دەژمێردرێ و پاش تەواوبوونی ماوەی ئەندامەتیی پەرلەمان، بۆی هەیە بچێتەوە سەر فەرمانەکەی خۆی، یان فەرمانێکی هاوشێوەو ماوەی ئەندامەتیی پەرلەمانیشی بۆ مەبەستی پایەبەرزکردنەوە و قیدەم و پلە پێدان وخانەنشینی بۆ ئەژماردەکرێ.

**{ئەندامی پەرلەمان لە رۆژی سوێندخواردنی دەستوورییەوە دەستبەرداری فەرمانی پێشووی دەبێ و دەست لە کاری پێشووی هەڵدەگرێت، بەلاَم دوای کۆتاییهاتن بە ماوەی**

ئەندامبوونی لە پەرلەماندا، مافی گەڕانەوەی بۆ سەرکاری خۆی، یان کارێکی نزیك لە کاری جارانی هەیە، ماوەی ئەندامیەتی لە پەرلەماندا بە مەبەستی زیادبوونی مووچە و پلەداریەتی و پێشکەوتن و خانەنشینی بۆ ئەژمار دەکرێت}.

**ماددەی (46)**

{ئەندامبوون لە پەرلەمانی هەرێمی کوردستاندا ناگونجێ لەگەڵ ئەندامیەتی لە پەرلەمانی فیدراڵ، یان لە ئەنجومەنی خۆجێیی، یان شارەوانی، یان فەرمانبەرایەتی گشتی. لەو ماوەی ئەندامی پەرلەمان دەبێ بۆی نییە کاری پیشەیی خۆشی بکات}.

**ماددەی (47)**

{یەکەم: پەرلەمان لە ساڵێکدا دوو خول هەر یەکەیان بە چوارمانگ دەبەستێ، پێڕەوی ناوخۆی پەرلەمان چۆنێتی بەستنی دیاری دەکات، ئەو خولەی کە بودجەی گشتی تێدا تاوتوێ دەکرێت، تا بڕیاری لەسەر نەدرێت، کۆتایی بە کۆبوونەوەکانی پەرلەمان نایێ}.

دووەم: دەکرێ خولی بەستنی پەرلەمان لەسەر داوای سەرۆکی هەرێم، یان سەرۆکی پەرلەمان، یان سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران، یان بیست و پێنج ئەندام پەرلەمان بۆ ماوەی سی (30) رۆژ زیاتر نەبێت، درێژبکرێتەوە، تا ئەو ئەرکانەی پێویستییان بە ماوەکە هەیە، جێبەجێ بکرێن.

**ماددەی (48)**

{ ڕێژەی ئامادەبوونی قانوونیی (نیساب) لە پەرلەماندا بە ئامادەبوونی زۆرینەی ڕەهای ئەندامانی پەرلەمان دەبێ، بڕیارەکانی بە دەنگی زۆرینەی ئامادەبووان دەردەچن، ئەگەر دەقێکی پێچەوانە لە قانوونەکەدا نەبێت، ئەگەر دەنگەکانیش یەکسان بوون، ئەوا بەو لایەدا دەشکێتەوە، کە سەرۆکی پەرلەمان دەنگی پێداوە}.

**ماددەی (49)**

دە ئەنــدامی پەرلــەمان دەتــوانن پێــشنیازی یاســایەك یــان بڕیارێــك پێــشكەش بــە پەرلەمان بكەن.

**{(دە) ئەندام پەرلەمان، یان زیاتر دەتوانن پێشنیازی پرۆژەی قانوون، یان بڕیار بكەن}.**

**ماددەی (50)**

**{یەكەم: ئەندام پەرلەمان دەتوانێ پرسیار لە سەرۆك وەزیـران و جێگرەكـەی و وەزیرەكان سەبارەت بەو كارانەی تایبەتن بە ئەنجومەنی وەزیران، یـان یـەكێك لـە وەزارەتەكان بكات، قانوونی پەرلەمان و پێڕەوی ناوخۆی ڕێكی دەخات.**

**دووەم: (دە) ئەندام پەرلەمان دەتوانن لە سەرۆك، یان لە ئەندامانی ئەنجومەنی وەزیران بپرسنەوە، گفتوگۆ سەبارەت بەو لێپرسینەوە پـاش هەشـت ڕۆژ، لـە ڕۆژی گەیـشتنی داواكـە بـە سـەرۆكایەتی ئەنجومـەنی وەزیـران ئینجـا دەكرێـت، ئەگـەر لێپرسینەوەكە گەیشتە ڕادەی داوای متمانە كێشانەوە لە سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیران، یان وەزیرێك، ئەوا متمانە كێشانەوە لە سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیران بە دەنگدانی دوو لەسەر سێی (3/2) ئەندامانی پەرلەمان دەبێ، بۆ وەزیر بە زۆرینەی ڕەهای ئەندامانی پەرلەمان}.**

**ماددەی (51)**

سەرۆكی پەرلەمان و جێگرەكەی و سكرتێری گشتی و ئەنـدامانی پەرلـەمان شـایانی چەند ماف و ئیمتیازێكن كە سەربەخۆیی و ڕەوشێكی ژیانی گونجاویان بۆ دابین بكـەن، ئەمەش بە یاسایەك دیاردەكرێن و ڕێكدەخرێن.

**{ماف و ئیمتیازەكانی سەرۆكی پەرلەمان و جێگرەكەی و سـكرتێر و ئەنـدامانی پەرلەمان بە قانوون دیاری دەكرێن}.**

**ماددەی (52)**

وردەکاریی و بەڕێوەچوونی کاری پەرلەمان و چۆنیەتی بەستنی کۆبوونەوە ئاسایی و نائاساییەکانی و ڕێکخستنی و بەڕێوەبردنیان وحاڵەتەکانی کۆتایی هاتنی ئەنداماەتی و چۆنیەتی پڕکردنەوەی کورسیە چۆڵەکان بە یاسای پەرلەمان و پێڕەوە نێوخۆییەکەی دیار دەکرێن و ڕێك دەخرێن.

**{قانوونی پەرلەمان و پێڕەوی ناوخۆی چۆنیەتی کارکردن لەناو پەرلەمان و بەستنی دانیشتنی ئاسایی و نائاسایی و حاڵەتی کۆتاییهێنان بە ئەندامیەتی و چۆنیەتی پڕکردنەوەی کورسییە بەتاڵەکان دیاری دەکات}.**

**ماددەی (53)**

پەرلەمان بێجگە لەو ئەرکانەی بەپێی یاسا کارپێکراوەکانی هەرێم پێی دەسپێردرێن ئەم ئەرکانەشی لەسەر شانە:

**یەکەم:** بڕیاردان لەسەر پرسە چارەنووس سازەکانی گەلی کوردستان- عێراق بە دەنگی زۆرینەی دوو لەسەر سێی ئەندامەکانی.

**{دووەم: پەسندکردنی پێشنیازی هەموارکردنی دەستووری هەرێم بە زۆرینەی دەنگی دوو لەسەر سێی (3/2) ئەندامانی پەرلەمان دەبێ، بە مەرجێك ئەو هەموارکردنە نەبێتە هۆی کەمکردنەوەی ئەو مافە سەرەکی و ئازادییانەی لەم دەستوورەدا هاتوون}.**

**سێیەم:** 1- دانانی یاسا لە هەرێمی کوردستان، کە هەموارکردن و هەڵوەشاندنەوەی یاساکانیش دەگرێتەوە لە هەموو پرسێکدا، جگە لەو پرسانەی بە تەواوی دەکەونە نێو دەسەلأتی یاسادانانی تایبەتی (حصری) دەسەلأتەکانی فیدراڵی کە بەپێی ماددەی (110)ی دەستووری فیدراڵی پێیان دراوە.

**{1- دانانی قانوون بۆ هەرێمی کوردستان و هەموارکردن و پووچەڵکردنەوەیان}.**

2- بڕیاردان لەسەر کارپێکردنی یاسا فیدراڵیەکان لە هەرێمی کوردستاندا و هەموارکردنی جێبەجێ کردنیان، ئەمەش بە یاسایەك دەبێ، جگە لەو یاسانەی کە بەپێی ماددەی (110)ی دەستووری فیدراڵی بە تەواوی دەکەونە بەر دەسەلأتە

تایبەتیەکانی (حصری) دەسەڵاتەکانی دەوڵەتی فیدراڵ، کە لەگەڵ کارپێکرانیان بەپێی حوکمەکانی دەستووری فیدراڵی، لە کوردستانیش جێبەجێ دەکرێن.

**{2- هەموارکردنی چۆنیەتی پیادەکردنی ئەو قانوونە یەکگرتووانەی لە دەرەوەی دەسەڵاتە دیاریکراوەکانی (حەسری) دەسەڵاتە فیدرالییەکاندان}.**

**{ئەگەر بڕگەی (سێ) لە ماددەی سێی ئەم پرۆژەیە، بەو شێوەی پێشتر پێشنیازم کردووە پەسەند بکرێ: "ئەو قانوونانەی لە لایەن دەسەڵاتی یەکگرتووەوە دەردەچن لە هەرێمی کوردستان کاریان پێناکرێ، تا پەرلەمانی هەرێمی کوردستان پەسەندیان دەکات"، ئەم بڕگەیە زیاد دەبێ}.**

**چوارەم:** گرتنەبەری ڕێکاری تۆمەتبارکردنی سەرۆکی هەرێمی کوردستان، یان جێگرەکەی بە ڕەزامەندی دوو لەسەر سێی ئەندامانی پەرلەمان لەسەر بنەمای شکاندنی سوێندی دەستووری، یان پێشێلکردنێکی سامناکی دەستوور، یان خیانەتی گەورە.

**{چوارەم: لادانی سەرۆکی هەرێم، یان جێگرەکەی، بە دەنگی دوو لەسەر سێی ئەندامانی پەرلەمان، لە حاڵەتی خەتابارکردنی لە لایەن دادگای دەستووری کوردستانەوە، لە یەکێك لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا:**

**1- کارکردن بە پێچەوانەی سوێندی دەستووری.**

**2- پێشێلکردنی دەستوور.**

**3- ناپاکی (خیانەتی) گەورە}.**

**پێنجەم:** متمانەدان بە وەزارەت و ئەندامەکانی یان لێوەرگرتنەوەیان. متمانەوەرگرتنەوەش لە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران بە زۆرینەی دوو لەسەر سێی ئەندامانی پەرلەمان و لە وەزیریش بە زۆرینەی ڕەهای ژمارەی ئەندامان دەبێت.

**شەشەم:** چاودێریکردنی کارەکانی دەسەڵاتی جێبەجێ کردن و لێپرسینەوە لە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و جێگرەکەی و وەزیرەکان، بەپێی یاسا و ڕێکارەکانی پێڕەوی نێوخۆی پەرلەمان.

**{شەشەم: چاودێریکردنی کارەکانی دەسەڵاتی جێبەجێکردن و لێپێچینەوە لە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و جێگرەکەی و وەزیرەکان، بەپێی قانوون و پێڕەویی ناوخۆی پەرلەمان}.**

**حەوتەم:** پەسندکردنی بودجەی گشتی هەرێمی کوردستان و ژمێرکاریی کۆتایی و گواستنەوە لە نێو دەروازەکانی بوودجەدا و بڕیاردان لەسەر ئەو خەرجانەی لە بوودجەدا نەهاتوون.

**هەشتەم:** پەسندکردنی پلانە گشتیەکانی پەرەپێدان.

**نۆیەم:** دانانی باج و رەسمەکان و هەموارکردن و هەڵوەشاندنەوەیان، یان لێخۆشبوونیان.

**دەیەم:** بڕیاردان، بە زۆرینەی ڕەهای دەنگی ئامادەبووان لەسەر دروستی ئەندامەتیی لە پەرلەمان دەبێت، ئەم بڕیارەش دەکرێ، لە ماوەی سی ڕۆژ لەدوای دەرچوونیەوەن تانووتی لێ بدرێ لەبەردەم دادگای دەستووریی هەرێمەوە.

**{دەیەم: یەکلاییکردنەوەی دروستیی ئەندامیەتی لە پەرلەمان لە ماوەی سی (30) رۆژدا، لە رۆژی دەرچوونیەوە تانە لەبەردەم دادگەی دەستووری لە هەرێمی کوردستان دەبێ بدرێت}.**

**یازدەهەم:** دانانی پێڕەوی ناوخۆی پەرلەمان و دیاریکردنی میلاکی فەرمانبەرەکانی و خەملاندنی بودجەکەی و دامەزراندنی فەرمانبەرەکانی و دیاریکردنی مووچەکانیان.

**دوازدەهەم:** پێکهێنانی لیژنە هەمیشەیی و کاتیەکان و لیژنەکانی لێکۆڵینەوە.

**سێزدەهەم:** پەسەندکردنی پالاوتنی ئەندامانی دادگای دەستووریی هەرێمی کوردستان بە دەنگی زۆرینەی ژمارەی ئەندامەکانی.

**سێزدهەم:{ ئەم بڕگەیە لە کۆبوونەوەی لیژنەی دەستووری کە لە مانگی تەمووزی 2008دا بەسترابوو، خراوەتە سەر پرۆژەکە. ئەو کەسانەی بۆ ئەندامیەتی دادگای دەستووری کاندید دەکرێن پێویستە بە دەنگی دوو لەسەر سێی ئەندامانی پەرلەمان بێ، نەك بە زۆرینەی دەنگی ئەندامان}.**

**چواردەهەم:** پەسندکردنی پالاوتنی سەرۆکەکانی ئەو دەستە و کۆمسیۆنە سەربەخۆیانەی کە لە لە ماددەی (107)ی ئەم دەستوورەدا دەقنووس کراون، بە دەنگی زۆرینەی ڕەهای ژمارەی ئەندامانی.

**ماددەی (54)**

بەدەر لە حوكمی بڕگە (حەوتەم)ی ماددەی (65) كە لەم دەستوورەدا هاتووە، پەرلەمان بۆی نییە واز لە دەسەلاّتەكانی یاسادانی خۆی بێنێ.

**{پەرلەمان دەست لە دەسەلاّتی قانووندانان هەڵناگرێت، تەنیا لەو حاڵەتەدا نەبێت كە لە بڕگەی حەوتەمی ماددەی شەست و پێنجەمی ئەم دەستووره دیاری كراوە}.**

**ماددەی (55)**

**یەكەم**: ئەندام پەرلەمان پارێزراوەیی (حصانە)ی پەرلەمانی هەیە و بۆی هەیە لەو سنوورەی كە لە پێڕەوی ناوخۆی پەرلەماندا هاتووە بە ئازادی قسە بكات.

**{یەكەم: ئەندام پەرلەمان ئامێزگرتنی (حەسانە)ی پەرلەمانی هەیە بۆ قسەكردن و ڕادەربڕینی ئازادانە، بەو شێوەی لە پێڕەوی ناوخۆی پەرلەماندا هاتووە}.**

**دووەم**: بە رەزامەندیی پەرلەمان نەبێ، نابێ ئازادیی ئەندامی پەرلەمان كۆتبەند بكرێت، یان چاودێری بخرێتە سەر.

**{ئازادیی ئەندامانی پەرلەمان نابێ كۆتبەند بكرێت و چاودێریش لەسەریان دانانرێت بەبێ ڕەزامەندیی پەرلەمان}.**

**سێیەم**: ئەندامی پەرلەمان لە كاتی خولی كۆبوونەوەكانی پەرلەماندا، نابێ لە هیچ لایەنێكەوە، بەبێ ڕێگە پێدانی پێشتری پەرلەمان، ڕاوە دوو بنرێ یان لێكۆڵینەوەی لەگەڵدا بكرێ، یان خۆی یان ماڵی یان نووسینگەی بپشكێندرێ، مەگەر لە كاتی ئەنجامدانی تاوانێكی بەئاشكرادا بگیرێ.

**{سێیەم: لە كاتی خولی كۆبوونەوەكانی پەرلەماندا نابێ ئەندام پەرلەمان ڕاوەدوو بكرێت یان لێكۆڵینەوەی لەگەڵدا بكرێت، خۆی و ماڵەكەی و نووسینگەكەی ناپشكێنرێن و بەبێ رەزامەندیی پەرلەمان دەستگیر ناكرێت، مەگەر لە حاڵەتی تاوانی بینراودا}.**

**چوارەم**: نابێ ئەندامی پەرلەمان لەدەرەوەی خولی كۆبوونەوەی پەرلەماندا لە هیچ لایەنێكەوە، بەبێ ڕێگە پێدانی پێشتری پەرلەمان، ڕاوە دوو بنرێ یان لێكۆڵینەوەی لەگەڵدا بكرێ یان خۆی، ماڵی یان نووسینگەی بپشكێنرێ، مەگەر لەكاتی ئەنجامدانی تاوانێكی بەئاشكرادا بگیرێ.

**{چوارەم: ئەندام پەرلەمان لە دەرەوەی خولی كۆبوونەوەكانی پەرلەماندا، بەبێ رەزامەندیی سەرۆكی پەرلەمان ڕاوەدوو نانرێت و لێكۆڵینەوەشی لەگەڵدا ناكرێت و**

**دەستگیریش ناکرێت، مەگەر لە حاڵەتی تاوانی بینراودا، پاش دەستپێکردنەوەی کۆبوونەوەکانی پەرلەمان، دەبێ پەرلەمان لەو ڕێوشوێنانەی دەرهەقی کراون، ئاگادار بکرێتەوە}.**

**ماددەی (56)**

**یەکەم:** پەرلەمان بۆی هەیە، بە زۆرینەی دوو لەسەر سێی دەنگی ژمارەی ئەندامانی، خۆی هەڵوەشێنێتەوە.

**دووەم:** پەرلەمان لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا بە مەرسوومێکی **(فەرمانێکی)** سەرۆکی هەرێم هەڵدەوەشێتەوە:

1- ئەگەر پتر لە نیوەی ئەندامەکانی دەستیان لەکار کێشایەوە.

2- ئەگەر شەست ڕۆژ پاش بانگهێشتنی بۆ کۆبوونەوە لە دوای هەڵبژاردندا نیسابی یاسایی بۆ کۆبوونەوەی تەواو نەبوو.

3- ئەگەر متمانەی نەدا بە سێ کابینەی پێشنیازکراوی وەزاری جیاوازی یەك لەدوای یەکدا. **{ئەگەر پەرلەمان متمانە بە سێ پێکهاتەی وەزارەتیی پێشنیازکراوی جیاوازی یەك لە دوای یەك نەدا}.**

**مادەی (57)**

ئەگەر پەرلەمان هەڵوەشایەوە یان خولی هەڵبژاردنی تەواوبوو، مەرسومێك **(فەرمانێك)** دەردەچێت بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردنەکان و دیارکردنی ڕۆژی ئەنجامدانی لە ماوەی پازدە ڕۆژ لە هەڵوەشانەوەیدا، یان بەلای کەمی، نەوەد ڕۆژ پێش کۆتایی خولی هەڵبژاردن، بە مەرجێك ئەنجامدانی کاتی هەڵبژاردن لە نەوەد ڕۆژی دوای هەڵوەشاندنەوەی تێپەڕنەکات، یان دەبێ لە ماوەی نەوەد ڕۆژ پێش کۆتایی خولی هەڵبژاردن بێت.

**ماددەی (58)**

ئەگەر پەرلەمان بەپێی حوکمی ماددەی (56)ی ئەم دەستوورە هەڵوەشایەوە یان خولەکەی تەواوبوو، و نەش توانـدرا هەڵبژاردنێکی نوێ بکرێ، یان لەبەر هەلومەرجێکی دژوار، دواکەوت، پەرلەمان دەمێنێتەوە لەسەر ئەرك و دەسەلاتە دەستووریەکانی بەردەوام دەبێ هەتا پەرلەمانێکی نوێ هەڵدەبژێردرێ و یەکەمین

کۆبوونەوەی خۆی دەبەستێ. کارکردن بە مەرسوومی (**فەرمانی**) هەڵوەشاندنەوەکەش، هەتا هەڵبژاردنی پەرلەمانی نوێ، بە هەڵپەسێردراو دادەنێت.

**پێشنیاز:**

**{ئەگەر ماوەی خولی هەڵبژاردنی پەرلەمان کۆتایی هات و بە هۆی هەلومەرجێکی دژوارەوە نەتوانرا هەڵبژاردنێکی نوێ ساز بکرێت، پەرلەمان بەردەوام دەبێ لەسەر ئەرکەکانی خۆی، تا هەڵبژاردنی پەرلەمانێکی نوێ و کۆبوونەوەی یەکەمی ساز دەکات}.**

## بەشی دووەم
## دەسەڵاتی جێبەجێکردن (ڕاپەڕاندن)

**ماددەی (59)**

دەسەڵاتی جێ بە جێ کردن لە: سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان و ئەنجومەنی وەزیران و دەسەڵاتەکانیشیان بەپێ دەستوور و یاسا پیادەدەکەن.

### یەکەم: سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان - عێراق

**ماددەی (60)**

**یەکەم:** سەرۆکی هەرێمی کوردستان سەرۆکی باڵای دەسەڵاتی جێ بە جێ کردن (**ڕاپەراندنە**) و فەرماندەی گشتی هێزی پێشمەرگە (پاسەوانی هەرێم)ە ولە بۆنە نیشتمانی و نەتەوەییەکاندا نوێنەرایەتی گەلی هەرێم دەکات و هەماهەنگی لە نێوان دەسەلاتەکانی فیدراڵی و دەسەلاتنەکانی هەرێمدا دەکات.

**دووەم:** سەرۆکی هەرێمی کوردستان جێگرێك بۆ خۆی هەڵدەبژێرێ کە هاوکاریی دەکا لە ئەنجامدانی ئەرکەکانیدا و لە کاتی ئامادەنەبوونیدا جێی دەگرێتەوە و جێگری فەرماندەی گشتی هێزەکانی پێشمەرگەی (پاسەوانی هەرێم) دەبێ، بە مەرجێك رەزامەندیی پەرلەمان بەدەست بهێنێ بە زۆرینەی ڕەهای ژمارەی ئەندامانی.

**ماددەی (61)**

**سەرۆکی هەرێمی کوردستان لەڕێگای دەنگدانی گشتی، نهێنی، ڕاستەوخۆوە لە لایەن هاووڵاتییانی هەرێمی کوردستانەوە هەڵدەبژێردرێت، بەو شێوەی کە یاسا دیاری دەکا.[1]**

**ماددەی (62)**

**سەرۆکی هەرێم یان جێگرەکەی لەسەر پۆستەکەی لادەبرێ ئەگەر دادگای دەستووری بە تاوانکاری دانا لە لە ئاکامی تۆمەتبارکردنیەوە بە زۆرینەی دوو لەسەر سێی ئەندامانی پەرلەمانی کوردستان – عێراق، بە شکاندنی سوێندی دەستووریی یان پێشێلکردنی سامناکی دەستوور، یان ئەنجامدانی خیانەتی گەورە.**

**ماددەی (63)**

**سەرۆکی هەرێمی کوردستان و جێگرەکەی پێش دەست بەکاربوونیان، لەبەردەم پەرلەمانی کوردستاندا ئەم سوێندە دەستوریە دەخۆن:**

**(بەخودای گەورە سوێند دەخۆم کە ماف و دەسکەوتەکان و یەکێتی و بەرژەوەندیەکانی گەلی کوردستان – عێراق بپارێزم و ئەرك و فەرمانەکانم بەڕاستی و دڵسۆزی بە جێ بگەیەنم و پابەندی دەستووری هەرێمی کوردستان بم).**

**ماددەی (64)**

---

(1) لە پرۆژەی دەستووری ساڵی 1992دا سەرۆکی هەرێم پەرلەمانی هەرێم بە دەنگی 3/2ی ئەندامانی هەڵدەبژێردرێ، ئەگەر لە دەنگدانی یەکەمدا ئەو ڕێژەی بەدەست نەهێنا، لە دەنگدانی دووهەمدا بە زۆرینەی دەنگی ئەندامانی پەرلەمان دەبێتە سەرۆکی هەرێم. بەلام لەو پرۆژە دەستووری هەرێم، کە لە مانگی نۆڤەمبەری ساڵی 2002دا ئامادەکرابوو، سەرۆکی هەرێم بەو شێوەی کە سەرۆك کۆماری عێراق هەڵدەبژێردرێ، ئەویش هەڵدەبژێردرێ. لە دەستووری تازەی عێراقی ساڵی 2005، سەرۆك کۆمار لەلایەن (ئەنجومەنی نوێنەران)ەوە هەڵدەبژێرێ. لە قانوونی ژمارە (1)ی ساڵی 2005ی تایبەت بە سەرۆکی هەرێمی کوردستان، ڕاستەوخۆ لەلایەن دەنگدەرانەوە هەڵدەبژێردرێ. بۆ جاری یەکەم لە ناوەڕاستی ساڵی 2005دا سەرۆکی هەرێم لەلایەن پەرلەمانی هەرێمەوە هەڵبژێردرا، بەلام لە ساڵی 2009دا ڕاستەوخۆ لەلایەن دەنگدەرانەوە هەڵبژێرایەوە، (ئاوێنە) ژمارەی (179)، 2009/6/30.

ماوەی ویلایەتی سەرۆکی هەرێمی کوردستان چوار ساڵە، کە لە رۆژی سوێند خواردنی دەستوورییەوە دەستپێدەکات، و دەکرێ بۆ ویلایەتی دووەمیش هەڵ بژێردرێتەوە، لە رۆژی کارپێکردنی ئەم دەستوورەوە.

**{ماوەی ویلایەتی سەرۆکی هەرێمی کوردستان چوار ساڵە، لە رۆژی سوێندخواردنی دەستوورییەوە دەستپێدەکات، دەکرێ هەمان کەس بۆ جارێکی دیکە هەڵبژێردرێتەوە}.**

**(ئەم ماددەیە بەو شێوەی لێرەدا پێشنیازکراوە، هەمان ئەو دەقەیە کە لە پرۆژەی دەستووری ئەیلوولی 2006دا دارێژرابوو، دوا رستەی ماددەکە: (لە رۆژی کارپێکردنی ئەم دەستوورەوە)، لە کۆبوونەوەی لیژنەی دەستووری لە مانگی تەمووزی 2008دا خراوەتە سەر پرۆژەکە. ئەم دەستکارییە دەبێتە هۆی ئەوە کە سەرۆکی هەرێم بتوانێ بۆ جاری سێهەم خۆی کاندید بکاتەوە، چونکە دیار نییە ئەم دەستوورە کەی پەسند دەکرێ و دەخرێتە بواری جێبەجێکردنەوە).**

**مادەی (65)**

سەرۆکی هەرێم سەرەڕای هەر دەسەڵاتێك کە بە یاسا پێی دەدرێ، ئەم دەسەڵاتانەی خوارەوەش پیادە دەکا.

**یەکەم:** پێشکەشکردنی پرۆژەی یاساو بڕیارەکان بۆ پەرلەمانی هەرێمی کوردستان.

**(یەکەم: پێشنیازکردنی پرۆژەی قانوون و بڕیار بۆ پەرلەمانی هەرێمی کوردستان).**

**دووەم:** دەرکردنی ئەو یاساو بڕیارانەی کە پەرلەمانی کوردستان دایاندەنێ، لەماوەی پازدە رۆژ لە وەرگرتنیانەوە، بۆشی هەیە لەو ماوەیەدا نارەزایی لەسەر هەموو یان بەشێکیان دەربڕێ و بیانرێتەوە بۆ پەرلەمان بۆ چاوپێداخشانەوەیان، و دواتر بڕیاری پەرلەمان لەبارەیەوە بنبڕ دەبێ، ئەگەر سەرۆك لەو ماوەیەدا یاساو بڕیارەکانی دەرنەکرد، بێ ئەوەی نارەزاییان لەسەر دەربڕێ، ئەوا بەدەرچوو دەژمێردرێن و سەرۆکایەتی پەرلەمان بلاوکردنەوەیان لە رۆژنامەی فەرمیدا لە ئەستۆ دەگرێت.

**(دووەم: دەرکردنی ئەو قانوون و بڕیارانەی کە پەرلەمانی کوردستان – عێراق پەسندیان دەکات لە ماوەی (دە) رۆژدا، لە رۆژی وەرگرتنیان لە لایەن دیوانی سەرۆکایەتییەوە، بەلام بۆی هەیە تانە لە بەشێك، یان لە هەموویان بدات و داوای چاوپێداخشاندنەوە و رەوانەی پەرلەمانی بکاتەوە، بڕیاری پەرلەمان یەکلاکەرەوە و**

**بنبڕ دەبێت، ئەگەر لە ماوەی دە رۆژدا لە لایەن سەرۆکایەتی هەرێمەوە دەرنەکرێت، بە پەسندکراو دادەنرێت و سەرۆکایەتی پەرلەمان لە رۆژنامەی فەرمیدا بلاّوی دەکاتەوە)**

**سێیەم:** دەرکردنی مەرسوومێك بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردنی گشتی پەرلەمان، لەکاتی هەڵوەشاندنەوەی یان تەواوبوونی خولەکەیدا، ئەمەش بەپێی ماددەی (57)ی ئەم دەستوورە.

**(سێیەم: دەرکردنی فەرمانی سەرۆکایەتی بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردنی گشتی پەرلەمانی هەرێمی کوردستان، لە کاتی هەڵوەشاندنەوەی یان کۆتاییهاتن بە ماوەی خولی هەڵبژاردن بەپێی ماددەی (96)ی ئەم دەستوورە.) ـ ئێستا بووەتە ماددەی (57).**

**چوارەم:** دەرکردنی مەرسوومێك بۆ بانگهێشت کردنی پەرلەمان بۆ یەکەم دانیشتنی خولی کۆبوونەوەی خولی هەڵبژاردنی لە ماوەی پازدە رۆژدا دوای ڕاگەیاندنی دوائەنجامەکانی هەڵبژاردندا، ئەگەر بانگهێشت کردنەکەشی نەکرد، پەرلەمان رۆژی دوای تەواوبوونی ئەو ماوەیە سەربەخۆ کۆدەبێتەوە.

**(چوارەم: دەرکردنی فەرمانی سەرۆکایەتی بۆ بانگهێشتکردنی پەرلەمانی هەرێمی کوردستان بۆ بەستنی یەکەم دانیشتنی خولی هەڵبژاردنی لە ماوەی پازدە رۆژدا، لە رۆژی ڕاگەیاندنی دوا ئەنجامەکانی. ئەگەر ئەو بانگهێشتنە نەکرێت، ئەوا پەرلەمان رۆژێك دوای تەواوبوونی ئەو ماوە دیاریکراوە، کۆدەبێتەوە).**

**پێجەم:** دەرکردنی مەرسومێك بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان، لەو حاڵەتانەی کە لەم دەستوورەدا هاتوون.

**(پێنجەم: دەرکردنی فەرمانی سەرۆکایەتی بە هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمانی کوردستان لەو حاڵەتانەی لەم دەستوورە، یان لە قانوونی پەرلەمانی کوردستاندا دیاریکراون).**

**شەشەم:** دەرکردنی مەرسومێك بۆ لەسەر کار لابردنی وەزیر، لەسەر پێشنیازی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**(شەشەم: دەرکردنی فەرمانی سەرۆکایەتی بەلابردنی وەزیرێك، لەسەر پێشنیازی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران).**

**حەوتەم:** دەرکردنی ئەو مەڕسومانەی کە هێزی یاساییان هەیە، پاش ڕاوێژکردن لەگەڵ سەرۆکی پەرلەمان و ئەنجومەنی وەزیران، ئەگەر هەرێمی کوردستان و سیستمە

سیاسـیەکەی، یـان ئاسایـشی، یـان دامـەزراوە دەسـتووریەکانی کەوتنـە بـەر مەترسـیەکی لەناکاو و پەرلەمانیش نەیتوانی کۆبێتەوە، بە مەرجێك ئەو مەرسومانە بخرێنـە پـێش چاوی یەکەمین کۆبوونەوەی پەرلەمان، ئەگەر نەش خرانـە بەرچـاوی پەرلـەمان ، یـان خرانە بەرچاوی پەرلەمان و ئەویش پەسەندی نەکردن، ئاکاری یاساییان نامێنێ.

**(حەوتەم: دەرکردنی فەرمانی سەرۆکایەتی، کە هێزی قانوونی هەیە، دوای ڕێککەوتن لەگەڵ سەرۆکی پەرلەمان و سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران، ئەگەر هەرێمی کوردستان و سیستمی سیاسی، یـان ئاسایـشی گـشتی، یـان دامـەزراوەکانی دەسـتووری بـەرەوڕووی مەترسیی تێکدەرانەی ئـەوتۆ بـن، کـە هەڕەشـە لـە قەوارەکـەی بکـات و پەرلـەمان نەتوانێت کۆببێتەوە، بە مەرجێك ئەو فەرمانانە لە یەکەم کۆبوونەوەی پەرلەماندا بخرێنە بەردەمی. ئەگەر نەخرانە بەردەمی، یان خرانە بەردەمی پەرلەمان پەسندی نەکردن، ئەوا سیفەتی قانوونی لەدەست دەدەن).**

**هەشـتەم:** جـاڕدانی بـاری نائاسـایی، پـاش ڕاوێـژکردن و ڕێککـەوتن لەگـەڵ سـەرۆکی پەرلـەمان و سـەرۆکی ئەنجومـەنی وەزیـران لـە حاڵـەتی شـەڕ، داگیرکـردن، یـاخیبوون، ئاژاوە، کارەساتی سروشتی، یان بڵاوبوونەوەی پەتا، یان هەر حاڵەتێکی لەناکاوی دیکەدا، بە مەرجێك ماوەکە لە مانگێـك پـتر نـەبێ و درێژکردنـەوەی دواتـریش بـە ڕەزامەنـدی زۆرینەی ڕەهای ئەندامانی پەرلەمان و بۆ ماوەیەك دەبێ کە بۆ هەر درێژکردنەوەیەك، لە سێ مانگ تێپەڕێ. حوکمەکانی حاڵەتی نائاساییش بە یاسایەك ڕێکدەخرێن.

**(ڕاگەیاندنی باری نائاسایی لە حاڵەتی جەنگ، داگیرکردن، یاخیبوون، پشێوی، کارەساتی سروشتی، بڵاوبوونەوەی پەتا، یان هەر حاڵەتێکی نائاسایی کتوپڕیی دیکە، بەو مەرجەی ماوەی یەکەمیان لە مانگێك تێپەڕ نەکات و درێژکردنەوەکانی پاشتر بۆ ماوەیەك بن، کە هەرجارە لە سێ مانگ تێپەڕ نەکات، بە ڕەزامەندبوونی زۆرینـەی ڕەهای ئەندامانی پەرلەمان، حوکمە تایبەتییەکانی باری نائاسایی بە قـانوون ڕێـك دەخرێن).**

**نۆیەم:** لێبوردنی تایبەتی زیندانیان بەدەرکردنی مەرسومێك بەپێی یاسا.

**(نۆیەم: دەرکردنی لێبووردنی تایبەت بە تاوانباران، کە بە قانوون ڕێك دەخرێت).**

**دەیەم:** پەسندکردنی حوکمی ئیعدام یان سوککردنی بۆ زیندانی هەتاهەتایی.

**(دەیەم: پەسندکردنی بڕیاری لە سێدارەدان، یان کەمکردنەوەی بۆ زیندانکردنی هەتایی).**

**یازدەهەم:** بانگهێشت کردنی ئەنجومەنی وەزیران بۆ کۆبوونەوەی نائاسایی لە کاتی پێویستدا بۆ باسکردنی هەندێ پرسی دیارکراو کە کۆبوونەوەیان بۆ ئەنجام دەدرێ، هەر بۆ خۆشی سەرۆکایەتی کۆبوونەوەکە دەکا.

**(یازدەهەم: بانگهێشتکردنی ئەنجومەنی وەزیران بۆ کۆبوونەوەی نائاسایی لە کاتی پێویستدا بۆ گفتوگۆ لەسەر ئەو بابەتە دیاریکراوانەی کۆبوونەوەکەی بۆ بەستراوە، لەگەڵ سەرۆکایەتیکردنی ئەو کۆبوونەوەیە).**

**دوازدەهەم:** ڕێگەدان بە هاتنی بەشێك لە هێزە چەکدارە فیدراڵیەکان بۆ کوردستانی – عێراق لەکاتی پێویستدا، پاش وەرگرتنی ڕەزامەندیی پەرلەمانی کوردستان – عێراق لەسەر هاتنە ژوورەوەی ئەم هێزانە لەگەڵ دیارکردنی ئەرك و فەرمانیان و جێگاو ماوەی مانەوەیان لە هەرێمدا.

**(دوازدەهەم: ڕێگەدان بە هاتنی هێزی چەکداریی یەکگرتوو بۆ هەرێم، یان هەر یەکەیەکی سەربازیی دیکە لە کاتی پێویستدا، بە رەزامەندیی پەرلەمانی کوردستان، بە مەرجێك ئەرك و شوێن و ماوەی مانەوەیان بە ڕوونی دیاری بکرێن).**

**سێزدەهەم:** ناردنی هێزەکانی پێشمەرگە (پاسەوانی هەرێم) یان هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆ بۆ دەرەوەی هەرێم بە ڕەزامەندی پەرلەمان.

**(سێزدەهەم: سەرۆکی هەرێم بە رەزامەندیی پەرلەمانی هەرێم، بۆی هەیە هێزی پێشمەرگە "پاسەوانانی هەرێم"، یان هێزی ئاسایشی ناوخۆی هەرێم بۆ دەرەوەی هەرێم بنێرێت).**

**چواردەهەم:**

1- ڕاسپاردنی پاڵێوراوی ئەو فراکسیۆنەی زۆرترین ژمارەی هەیە بۆ پێکهێنانی وەزارەت لە ماوەی چل و پێنج رۆژ، لە مێژووی راسپاردنییەوە.

2- ڕاسپاردنی پاڵێوراوێکی دیکە لە هەمان فراکسیۆن بۆ پێکهێنانی وەزارەت، ئەگەر پاڵێوراوی یەکەم لە ماوەی چل و پێنج ڕۆژی دوای ڕاسپاردنی نەیتوانی وەزارەت پێکبهێنێ.

3- ئەگـەر پـاڵێوراوی دووەمـیش نـەیتوانی کابینـە پێکبێنـێ، سـەرۆکی هـەرێمی کوردسـتان بـۆی هەیـە هـەر کەسـێکی پێـی بـاش بـوو هەڵبـژێرێ و ڕای بـسپێرێ بـۆ پێکهێنانی وەزارەت.

4- دەکـرێ ئـەوەی ڕادەسـپێردرێ وەزارەت پێکبهێنـێ یـەکێك بـێ لـە ئەنـدامانی پەرلەمان، یان کەسێکی دیکە بێ.

**(چواردەهەم:**

**1- ڕاسـپاردنی پـاڵێوراوی ئـەو گرووپـە پەرلەمانییـەی زۆرینـەی ژمـارەی کورسییەکانیانی بەدەستهێناوە بۆ پێکهێنانی کابینەی وەزیران لە ماوەی سی (30) ڕۆژدا، لە ڕۆژی راسپاردنییەوە.**

**2- لە حاڵەتی سەرنەکەوتنی پاڵێوراوی یەکەم بۆ پێکهێنـانی وەزارەتەکـەی لـەو ماوەیەدا، سەرۆکی هەرێم پاڵێوراوێکی دیکە لە هەمان فراکسیۆن ڕادەسپێرێ بۆ ئەو ماوەی لە برگەی یەکەمدا دیاری کراوە.**

**3- لە حاڵەتی سەرنەکەوتنی پاڵێوراوی دووەمیش بۆ پێکهێنانی وەزارەت، سەرۆکی هەرێم بۆی هەیە کەسێکی تری شیاو بۆ پێکهێنانی وەزارەتەکە رابسپێرێ.**

**4- کەسی پاڵێوراو بۆ پێکهێنانی وەزارەت، دەشێ ئەندامی پەرلەمان بێ، یـان لـە دەرەوەی پەرلەمان بێ).**

**پازدەهـەم:** دەرکردنـی مەرسـومێك بـۆ پێکهێنـانی وەزارەت پـاش ئـەوەی متمانـەی پەرلەمانی وەرکرت.

**شازدەهەم:** دەرکردنی مەرسومێك بۆ لەسـەر کـارلادانی وەزارەت یـان وەزیـر، ئەگـەر متمانە لە هەر یەکێکیان وەرگیرایەوە.

**(شازدەهەم: دەرکردنی فەرمانی سەرۆکایەتی بە قبولکردنی دەست لەکار کێشانەوەی وەزیرێـك یـان ئەنجومـەنی وەزیـران بـە گـشتی و راسـپاردنی بـە درێژەپێـدان بـە ئەرکەکانیان تا پێکهاتنی وەزارەتێکی تازە).**

**حەڤدەهـەم:** دەرکردنـی مەرسـومێك بـۆ ڕەزامەندیـدان لەسـەر دەسـت لـە کـار کێشانەوەی وەزارەت یان وەزیر و ڕاسپاردنی بـۆ ئەنجامـدانی کارەکـەی هـەتا پێکهێنـانی وەزارەتێکی نوێ.

**هەژدەهەم:** دەرکردنی مەرسومێك بۆ پێکهێنانی ئەندامانی دادگای دەستووری، پاش ڕەزامەندیی پەرلەمانی کوردستان لەسەر پاڵێوڕاوەکان.

**نۆزدەهەم:** دەرکردنی مەڕسومێك بۆ دامەزراندنی دادوەرەکان و سەرۆکی دەستەی سەرپەرشتیاری دادوەری وسەرۆك و ئەندامانی داواکاری گشتی، دوای پاڵاوتنیان لەلایەن ئەنجومەنی دادوەریی لە هەرێمی کوردستان.

**(نۆزدەهەم: دامەزراندنی دادوەر و سەرۆك و ئەندامانی داواکاری گشتی، پاش پاڵاوتنیان لەلایەن ئەنجومەنی دادوەری لە هەرێم).**

**بیستەم:** دەرکردنی مەڕسومێك بۆ دامەزراندنی سەرۆکەکانی ئەو دەستە و کۆمسیۆنانەی کە لە ماددەی (107)ی ئەم دەستوورەدا دەقنووس کراون، پاش ڕەزامەندیی پەرلەمان لەسەر پاڵاوتنیان.

**بیست و یەکەم:** دەرکردنی بڕیارێك بۆ دامەزراندنی نوسینگەی تایبەت بە هەرێمی کوردستان لە وڵاتانی بیانیدا لەسەر پێشنیازی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران، بە هەماهەنگی لەگەڵ لایەنی تایبەتمەد لە حکومەتی فیدراڵیدا.

**(بیست و یەکەم: دەرکردنی فەرمانی سەرۆکایەتی بە دامەزراندنی ئەو نووسینگانەی تایبەتن بە هەرێمی کوردستان لە دەرەوەدا بۆ کاروباری ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و پەرەپێدانی ئابووری لەناو باڵوێزخانە و نێردراوە دیپلۆماتەکانی عێراقی لە دەرەوەدا).**

**بیست و دووەم:** دەرکردنی مەڕسومێك بۆ دامەزراندنی خاوەن پلە تایبەتەکان، لەسەر پاڵاوتنی وەزیری پەیوەندیدار و ڕەزامەندیی ئەنجومەنی وەزیران.

**(بیست و دووەم: (دەرکردنی فەرمانی سەرۆکایەتی بۆ دامەزراندنی خاوەن پایە تایبەتەکان، پاش پاڵاوتنیان لە لایەن وەزیری تایبەتمەند و رەزامەندیی ئەنجومەنی وەزیران.)**

**بیست و سێیەم:** بەخشینی پلە سەربازیەکان بە ئەفسەرانی پێشمەرگە (پاسەوانی هەرێم)و هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆ و دەرکردن و خانەنشین کردنیان، بە مەڕسومێك، بەپێی یاسا کارپێکراوەکان.

**(بیست و سێیەم: بەخشینی پلەی سەربازی بە ئەفسەرانی پێشمەرگە (پاسەوانی هەرێم)و هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆ، یان دەرکردنیان یان خانەنشینکردنیان بەپێی قانوون).**

**بیست و چوارەم:** بەخشینی نیشانەو مەدالیا بە مەرسومێك و بەپێی یاسا.

**(بیست و چوارەم: بەخشینی نیشانە و مەدالیای تایبەت بەپێی قانوون).**

**ماددەی (66)**

مووچە و دەرماڵەی سەرۆکی هەرێم و جێگرەکەی بە یاسا دیاری دەکرێن.

**ماددەی (67)**

سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان دیوانێکی دەبێ، کە پێکهاتە و دەسەلاّت و ئەرك و فەرمانەکانی بە یاسا دیاری دەکرێن.

**ماددەی (68)**

**یەکەم:** لە حاڵەتی دەست لەکار کێشانەی سەرۆکی هەرێم، یان مردنی، یان پەککەوتنی بەجۆرێك کە نەتوانێ ئەرکەکانی سەرۆکایەتی ئەنجام بدا جێنشینێکی لەماوەی شەست رۆژدا بۆ هەڵدەبژێردرێ بۆ ماوەی چوار ساڵ، بەپێی ماددەی (64)ی ئەم دەستوورە.

**(یەکەم: ئەگەر سەرۆکی هەرێم دەستی لە کار کێشایەوە، یان کۆچی دوایی کرد، یان تووشی پەککەوتەیی هەمیشەیی بوو، سەرۆکێکی دیکە بە هەمان شێوەی لەم دەستوورەدا دیاریکراوە، هەڵدەبژێردرێ).**

**دووەم:** ئەگەر شوێنی سەرۆکی هەرێمی کوردستان بەتاڵ بوو، سەرۆکی پەرلەمان ئەرکەکانی ڕادەپەڕێنێ تا سەرۆکێکی نوێ بە هەمان شێوە کە لەم دەستوورەدا هاتووە، هەڵدەبژێردرێت.

**سێیەم:** لە کاتی ئامادەنەبوونی سەرۆکی هەرێمی کوردستان، یان وەرگرتنی پشوو، جێگرەکەی ئەرکەکانی بەجێ دەگەیەنێت.

## دووەم: ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێمی کوردستان

**ماددەی (69)**

ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێمی کوردستان دەسەڵاتی ڕاپەڕاندنە لە هەرێمدا و لەژێر چاودێری و ئاڕاستەکردنی سەرۆکی هەرێمی کوردستاندا ئەرکەکانی جێبەجێ دەکات.

**ماددەی (70)**

**یەکەم:** ئەنجومەنی وەزیران لە سەرۆك و جێگرەکەی و وەزیرەکان پێکدێ و بە قانوون پێکهاتەکەی دیاری دەکرێت.

**دووەم:** کەسی دەستنیشانکراو بۆ پێکهێنانی ئەنجومەنی وەزیران، بە پێی بڕگەی سێزدە لە ماددەی نەوەدو پێنجی ئەم دەستوورە، رادەسپێردرێ.

**سێیەم:** سەرۆك وەزیرانی راسپێردراو، لە ئەندامانی پەرلەمانی کوردستان، یان لە کەسانی دی، کە مەرجی ئەندامییەتی پەرلەمانیان تێدایە، جێگرەکەی و وەزیرەکانی دەستنیشان دەکات.

**چوارەم:** سەرۆك وەزیرانی راسپێردراو لیستێك بە ناوی ئەندامانی وەزارەتەکەی پێشکەش بە سەرۆکی هەرێم دەکات بۆ پەسندکردنی.

**پێنجەم:** دوای پەسندکردنی لە لایەن سەرۆکی هەرێمەوە، سەرۆکی وەزیرانی راسپێردراو ئەندامانی وەزارەتەکەی پێشکەش بە پەرلەمان دەکات و داوای بڕواپێدانیان بۆ دەکات.

**شەشەم:** سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران سەرۆکایەتی دانیشتنەکانی ئەنجومەنی وەزیران دەکات، تەنیا لەو دانیشتنانەدا نەبێ، کە سەرۆکی هەرێم ئامادەی دەبێت.

**ماددەی (71)**

پاش متمانە وەرگرتن لە لایەن پەرلەمانەوە و پێش دەستبەکاربوونی ئەرکەکانیان بە شێوەیێکی فەرمی، سەرۆك و ئەندامانی ئەنجومەنی وەزیران، ئەم سوێندە دەستوورییە لەبەردەم پەرلەماندا دەخۆن:"سوێند بە خوای گەورە دەخۆم، کە بە دڵسۆزییەوە پارێزگاریی لە یەکیەتی گەل و خاکی کوردستانی- عێراق بکەم و رێز لە

دەستوورو قانوونە کارپێکراوەکانی بگرم و چاودێریی تەواوی بەرژەوەندییەکانی گەل بکەم".

**ماددەی (72)**

لە پێکهێنانی ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێمی کوردستاندا پێویستە ڕەچاوی نوێنەرایەتییەکی دادوەرانەی نەتەوەکانی هەرێم بکرێت.

**ماددەی (73)**

وەزیرەکان لەبەردەم پەرلەمانی کوردستاندا هەموویان هاوکارن لە بەرپرسیارەتی سەبارەت بە کارەکانی ئەنجومەنی وەزیران، هەر وەزیرێکیش خۆی بەرپرسی یەکەم و راستەوخۆ دەبێ لە کاری وەزارەتەکەی.

**ماددەی (74)**

ئەنجومەنی وەزیران ئەم دەسەڵات و تایبەتمەندییانەی خوارەوە جێبەجێ دەکات:

**یەکەم:** جێبەجێکردنی یاسا و بڕیارو پەیڕەوەکان و پارێزگاریکردن لە ئاسایشی کوردستان – عێراق و سامان گشتی.

**دووەم:** نەخشەکێشانی سیاسەتی گشتی هەرێم بە بەشداری سەرۆکی هەرێم و جێبەجێ کردنی، دوای پەسەندکردنی لەلایەن پەرلەمانەوە.

**سێیەم:** ئامادەکردنی پرۆژەی بودجەی گشتی هەرێمی کوردستان.

**چوارەم:** ئامادەکردنی پرۆژەی یاساو بڕیارەکان و پێشکەش کردنی بە پەرلەمان.

**پێنجەم:** دەرکردنی پێڕەو وبڕیارەکانی جێبەجێ کردن و کترگێڕی، بەپێ دەستوور و حوکمی یاساکان.

**شەشەم:** ئامادەکردنی پرۆژەکانی پەرەپێدان و جێبەجێکردنیان، پاش پەسەندکردنیان لەلایەن پەرلەمانەوە.

**حەوتەم:** پێکهێنانی فەرمانگەیەکی هاوبەش لەگەڵ حکومەتی فیدراڵی، بۆ بەڕێوەبردنی ئەو نەوت و گازەی پێش (2005/8/15) لە خاکی کوردستان دەرهێنراون و بەشێوەی بازرگانی بەرهەم هێنراون، بە مەرجێك ئەو داهاتەی لێی

بەدەست دێ بە شێوەیەکی دادپەروەرانە بەپێی ئەو بنەمایانەی لە ماددەی (112)ی دەستووری فیدراڵ و یاساکانی هەرێمی کوردستاندا دیارکراون دابەش بکرێ. بۆ جێبەجێکردنی حوکمی ئەم بڕگەیەش، پێوەری بەرهەمهێنانی بازرگانی بەوە دەناسرێت کە بەرهەمەکەی بەدرێژایی (12) مانگ، رۆژانە لە (5000) پێنج هەزار بەرمیل کەمتر نەبێ.

**{پێشنیاز دەکەم ئەم ماددەیە بەسەر دوو بڕگەدا دابەشبکرێت:**

**1- بەڕێوەبردنی کاروباری چاڵە نەوت و گازی دەرهێنراو لە هەرێمی کوردستانی عێراق، کە بەرهەمی بازرگانییان پێش پازدەی ئابی 2005 هەبووە، لە ئەستۆی حکومەتی هەرێمی کوردستان و حکومەتی یەکگرتوو دەبێ، بە مەرجێك داهاتەکانی بە شێوەیەکی دادوەرانە بەپێی ئەو بنەمایانەی لە ماددەی (112)ی دەستووری یەکگرتوودا دیاریکراون دابەش بکرێن، ئەوەش بە قانوون ڕێك دەخرێت.**

**2- بەرهەمهێنانی بازرگانی بۆ جێبەجێکردنی حوکمی بڕگەی یەکەمی ئەم ماددەیە، بە دەرهێنانی پێنج هەزار بەرمیلی نەوت لە رۆژێکدایە، لە ماوەی دوازدە مانگی پێش پانزەی ئابی 2005.}**

**هەشتەم:** کارکردنی هاوبەش لەگەڵ حکومەتی فیدراڵیدا بۆ دارشتنی سیاسەتەکانی ستراتیژی پێویست بۆ گەشەپێدانی سامانی نەوت و گاز، بەو مەرجەی لە هەر شتێکدا کە پێوەندی بە سامانی هەرێمەوە هەیە رەزامەندیی پەرلەمانی لەگەڵ بێ.

**(هەشتەم: حکومەتی هەرێمی کوردستان لەگەڵ حکومەتی یەکگرتوودا نەخشەی سیاسەتی ستراتیژی پێویست بۆ پەرەپێدانی سامانی نەوت و گازی هەرێم پێکەوە دەکێشن، پاش پەسندکردنی لە لایەن پەرلەمانی هەرێمەوە).**

**نۆهەم:** بەڕێوەبردنی هەر کارێك کە کێڵگەکانی نەوت و گازی خاوی دەرهێنراو، یان دەرهێنراوی بێ بەرهەم لە ڕووی بازگانیەوە، پێش 2008/8/15 پێویستیان پێ بێت، وەك پرۆسەکانی دۆزینەوە و بەرهەمهێنان و بەڕێوەبردن و گەشەپێدان و فرۆشتن و ناردنە بازاڕو گشت کارێکی دیکە، بەپێی یاساکانی هەرێم. بۆ مەبەستی جێ بە جێ کردنی حوکمی ئەم بڕگەیەش، بەرهەمی بازرگانی بەو بەرهەمە لێکدراوەتەوە کە بەدرێژایی (12) مانگ، رۆژانە بگاتە (5000) بەرمیل.

**(نۆهەم: لەو حاڵانەی نەوت و گازیان لێ دەرنەهێنراوە، یان دەرهێنراون بەڵام پێش پازدەی ئابی 2005 بەرهەمی بازرگانییان نەبووە، حکومەتی هەرێمی کوردستان دەتوانێ هەموو کارێکی پێویست سەبارەت بە دۆزینەوە و دەرهێنان و بەڕێوەبردن و دروستکردن و فرۆشتن و بازاڕدیتنەوە و ناردنەدەرەوە و کاری دیکەش بکات، کە دەبێ بە قانوون ڕێك بخرێت. پێوەری بەرهەمهێنانی بازرگانیی بۆ جێبەجێکردنی حوکمی ئەم بڕگەیە دەرهێنانی پێنج هەزار بەرمیلی نەوتە لە ڕۆژێکدا لەماوەی دوانزە مانگی پێش پازدەی ئابی 2005).**

**دەیەم:** پیادەکردنی دەسەڵاتە جێ بەجێکاریەکانی تایبەت بە هەرێمی کوردستان لە هەر شتێکی کە لەو تایبەتمەندیە (حصریانە)داهاتوون کە بۆ دەسەڵاتەکانی فیدراڵیدا بەپێی ماددەی (110)ی دەستووری فیدراڵی دەقنووس کراون.

**(دەیەم: پیادەکردنی ئەو دەسەڵاتانەی بەپێی مادەی 110ی دەستووری یەکگرتوو لە دەسەڵاتی دیاریکراوی فیدراڵی نین و ئەرکی جێبەجێکردنیان تایبەتە بە هەرێمی کوردستان).**

**پازدەهەم:** پیادەکردنی هەر شتێك کە دەسەڵاتە هاوبەشەکانی نێوان دەسەڵاتی فیدراڵ و دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان، بەپێی حوکمەکانی دەستووری فیدراڵ ڕێی پێداون.

**(یازدەهەم: پیادەکردنی ئەو دەسەڵاتە هاوبەشانەی لە دەسەڵاتی حکومەتی یەکگرتوو و دەسەڵاتی هەرێمدان، بەپێی حوکمەکانی دەستووری یەکگرتووی عێراق).**

**دوازدەهەم:** سەرپەرشتی کردنی کاری وەزارەتەکان و دامودەزگان و شوێنە گشتییەکانی هەرێمی کوردستاندا و ڕێنمایی کردنیان و بەدواچوونیان و چاودێری و هەماهەنگی کردن لە نێوانیاندا.

**سێزدەهەم:** دامەزراندن و پلە بەرز کردنەوە و دەرکردن و لادانی فەرمانبەران و خانەنشین کردنیان بەپێی یاسا، بە چەشنێك ناکۆك نەبێ لەگەڵ حوکمەکانی ئەم دەستوورەو ئەو یاسانەی کە بەپێی حوکمەکانی دەستوورەوە دەردەچن.

**(سێزدەهەم: دامەزراندنی فەرمانبەران و دیاریکردنی مووچە و بەرزکردنەوە و دەرکردن و لابردن و خانەنشینکردنیان بەپێی قانوون، بە مەرجێك بە پێچەوانەی قانوونی ئەنجومەنی خزمەتگوزاریی مەدەنی لە هەرێم نەبێ).**

**چـواردەهەم:** پێـشنیازی دامەزرانـدنی نووسـینگەکانی تایبـەت لـە هـەرێم لـە باڵوێزەخانـەو نێـردراوە دیپلۆماتـەکان بـۆ کاروبـاری ڕۆشـنبیری و کۆمەڵایـەتی و پەرەپێدان و بەڕێوەبردنیان. پاڵاوتنی بەڕێوەبەرانی ئەم نووسینگانەش بە ڕەزامەنـدی پەرلەمان دەبێت.

**(چواردەهەم: دەستنیشانکردنی نوێنەرانی هەرێم لە دەستەکانی فیدراڵیی سەربەخۆ و ئەو فەرمانبەرایەتییە فیدراڵییانەی لە پایەی بەڕێوەبەری گشتی و بەرەوژوورن، پاش وەرگرتنی ڕەزامەندیی پەرلەمانی هەرێمی کوردستان).**

**پازدەهەم:** ڕێکخستن و بـەڕێوەبردنی هێزەکـانی پێـشمەرگە (پاراسـتنی هـەرێم) بـۆ پاراسـتنی هـەرێم، و پـۆلیس و دەزگاکـانی ئاسـایش و پێکهاتـەکانی دیکـەی هێزەکـانی ئاسایشی ناوخۆ.

**(پازدەهەم: دروستکردن و ڕێکخستنی هێزی ئاسایشی ناوخۆی هەرێم، وەك پۆلیس و ئاسایش و پاسەوانی هەرێم).**

**ماددەی (75)**

**یەکـەم:** ئەنجومـەنی وەزیـران لـەم حاڵەتانـەی خـوارەوەدا بـە دەسـت لـە کـار کێـشایەوە دادەنـرێ و داوا لـە وەزارەت دەکـرێ هـەتا پێکهێنـانی وەزارەتـی نـوێ، کارەکـان بـەڕێوە بەرێ:

1- پەسند کردنی (قبول) دوای دەست لە کارکێشانەوەی سەرۆکەکەی.
2- سەندنەوەی متمانەی پەرلەمان لە سەرۆکەکە.
3- دەست بەکاربوونی خولێکی نوێی پەرلەمان.
4- دەستپێکردنی ویلایەتێکی نوێی سەرۆکی هەرێم.
5- مردنی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دووەم:** وەزیر بە دەست لەکارکێشایەوە دادەنرێ، ئەگەر پەرلەمانی کوردستان – عێراق متمانەی لێ وەرگرتەوە.

**(یەکەم: ئەنجومەنی وەزیران لە یەکێك لەم حاڵەتانەدا بە هەڵوەشاوە دادەنرێت:**

**1- دەستکێشانەوەی سەرۆکەکەی.**
**2- پەرلەمانی هەرێمی کوردستان متمانە لە سەرۆکەکەی وەربگرێتەوە.**

3- دەستپێکردنی خولێکی نوێی پەرلەمانی هەرێمی کوردستان.
4- دەستپێکردنی ویلایەتێکی نوێی سەرۆکی هەرێمی کوردستان.
5- کۆچی دوایی سەرۆکی ئەنجومەن.

**دووەم:** وەزیر بەدەستکێشەرەوە دادەنرێت ئەگەر پەرلەمانی کوردستان متمانەی لێ وەربگرێتەوە.

**سێیەم:** ئەنجومەنی وەزیرانی هەڵوەشاوە، ئەنجومەنێکی تایبەت دەبێ بە بەڕێوەبردنی کاروباری ڕۆژانە، تا پێکهێنانی ئەنجومەنێکی نوێ).

**ماددەی (76)**

**یەکەم:** چۆنێتی تۆمەتبارکردنی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و جێگرەکەی و وەزیرەکان و دادگاییکردنیان بە قانوون دیاری دەکرێت.

**دووەم:** یاسا مووچە و دەرماڵە و ئیمتیازەکانی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و جێگرەکەی و وەزیرەکان دیار دەکا.

## بەشی سێیەم

## دەسەڵاتی دادوەری

## یەکەم: بنەما گشتیەکان

**ماددەی (77)**

دەسەڵاتی دادوەری لە هەرێمی کوردستان سەربەخۆیە و لە ئەنجومەنی دادوەری و دادگای دەستووری و، دادگای پێداچوونەوە و دەستەی سەرپەرشتی دادوەری و دەستەی داواکاریی گشتی و دادگاکان بە گشت پلەو جۆرو دەستەکانیەوە پێکدێ، و ڕێکخستنی شێوەی پێکهێنان و مەرج و ڕێکاری دامەزراندنی ئەندامەکانیان و لێپرسینەوەیان بە یاسایەك ڕێکدەخرێ.

**ماددەی (78)**

دادوەری سەربەخۆیەو جگە لە یاسا هیچ دەسەڵاتێکی بەسەرەوە نیە.

**(دەسـەلأتی دادوەری سـەربەخۆیە، جگـە لـە قـانوون هـیچ دەسـەلأتێکی دیکـەی بەسەرەوە نییە).**

**ماددەی (79)**

دادوەری، دەســەلأتی گــشتی (ولايــة عامــة)ی بەســەر هــەموو کەســە سروشــتی و مەعنەویەکانەوە هەیە لە هەرێمی کوردستاندا.

**(دادگە ویلایەتی گشتی بەسەر هەموو کەسانی ئاسایی و مەعنـەوی لـە هـەرێمی کوردستاندا هەیە).**

**ماددەی (80)**

حوکم و بڕیارە دادوەریەکان بەناوی گەلەوە دەردەکرێن و جێ بەجێ دەکرێن.

**(بڕیارەکانی دادگەکان بە ناوی گەلەوە دەردەچن و جێبەجێ دەکرێن).**

**ماددەی (81)**

هـەموو دادوەران، بـۆ ماوەیـەکی دیارنـەکراو دادەمـەزرێن و لەتەمـەنێك خانەنـشین دەکرێن کە یاسا دیاری دەکاو، نابێ لەسەر کار لابـبرێن مەگـەر لـەو حاڵەتانـەدا کـە یاسـا دیاریــان دەکــاو، پێویــستە هەلومــەرجێکی لــەبار بــۆ کــاری دادوەران دابــین بکــرێ و پاداشـتێکایان بـدرێتێ کـە لەگـەڵ کەرامـەتی جێگـەو پێگـەیان و قـەبارەی ئەرکـەکانیان بگونجێ و، سەربەخۆییان بپارێزێ، هەروەها تا ئەو کاتەی لەپۆسـتەکانیاندا مـاون نـابێ پاداشتەکانیان کەم بکرێتەوە.

**(دادەوەر لەسەر کارەکەی لانابرێ، مەگەر لەو حاڵەتانەدا نەبێ کە قانوون ڕێگای پێداوە).**

**ماددەی (82)**

ئەم کارانەی خوارەوە لە دادوەرو ئەندامانی داواکاریی گشتی قەدەغەنە:

**یەکــەم:** کۆکردنــەوەی فەرمانبــەرایێتی دادوەریــی لەگــەڵ هــەر فەرمانبەریــەکی یاسادانان، یان جێبەجێکردن، یان هەر کارێکی دیکەدا.

دووەم: چوونە نێو حزبێك یان ڕێکخراوێکی سیاسی.

**(دادوەر و ئەندامی داواکاریی گشتی نابێ یەکێك لەم کارانەی خوارەوە بکەن:**

**یەکەم: کۆکردنەوە لە نێوان خزمەتی دادوەری و خزمەتی فانوونداناب یان جێبەجێکردن، یان کارێکی دیکە.**

**دووەم: چوونە ریزی پارتێکی سیاسی، یان کارکردن لە بواری چالاکیی سیاسیدا).**

**ماددەی (83)**

دانیشتنەکانی دادگا ئاشکران، مەگەر دادگا بڕیار بدا بۆ ڕەچاوکردنی دابونەریتی گشتی، یان لەبەر ڕێزی خێزان نهێنی بن، ئەویش بەو مەرجە حوکمەکە لە دانیشتنێکی ئاشکرادا ڕابگەیەندرێ.

**(دادگاییکردن بە ئاشکرا دەکرێ، مەگەر دادگە خۆی لەبەر ڕەچاوکردنی باری پەیڕەوی گشتی، یان ئادابی گشتی، یان ڕێزی خێزان بڕیاری پۆشینیان بدات، بە مەرجێك بڕیارەکە لە دانیشتنێکی ئاشکرادا بدرێت).**

**ماددەی (84)**

پێکهێنانی **(دامەزراندنی)** دادگای تایبەتی، یان نائاسایی لە هەرێمی کوردستاندا قەدەغەیە.

**ماددەی (85)**

بە یاسایەك دادگاکانی تایبەتمەند بە تێروانینی ئەو تاوانانەی کە سروشتی سەربازیان هەیە و کارمەندانی هێزی پێشمەرگەی (پاسەوانی هەرێم) و هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆ ئەنجامیان دەدەن و هەروەها ئەو تاوانانەی کە لە نێو تاکەکانی ئەو هێزانەدا ڕوودەدەن، ڕێکدەخرێن.

**(فانوون ئەو دادگە تایبەتییانە ڕێك دەخات، کە تایبەت دەبن بە تەماشاکردنی تاوانی سەربازی، یان لەنێو ئەو کەسانەی سەر بە هێزی پێشمەرگە و هێزی ئاسایشی ناوخۆن، یان ئەو تاوانانەی لە نێو کەسانی سەر بە هێزی پێشمەرگە و کەسانی سەر بە ئاسایشی ناوخۆ ڕوودەدەن).**

**ماددەی (86)**

قەدەغەیە لە یاساکاندا دەقی وا بێت کە ڕێگەنەدا بە دادگاکان گوێ لەو داوایانە بگرن کە لەو یاسانەوە سەر هەڵدەدەن.

**(یەکەم: ناکرێ ئەو حوکمانەی تایبەت دەبن بە باری کەسیەتی ئایینێك، بەسەر کەسانی سەر بە ئاینێکی دیکەدا بسەپێندرێن.**

**دووەم: ئەو کەسانەی سەر بە ئایین و ئایینزای جیاوازن، وەك مەسیحی و ئێزدی و کەسانی تر، ئەنجومەنی ڕووحانی تایبەتییان بۆ دادەمەزرێ و کار بە حوکمی تایبەت بە باری کەسیەتی خۆیان دەکەن، کە بە قانوون دیاری دەکرێت و دادگەی تایبەت بە باری کەسیەتی خۆیان تەماشایان دەکات.**

**سێیەم: حوکمی ئەو قانوونانەی تایبەتن بە باری کەسیەتی ناموسوڵمانان جێبەجێ دەکرێت، تا ئەو کاتەی قانوونێکی تایبەت بە باری کەسیەتی ناموسڵمانان پەسند دەکرێت).**

**ماددەی (87)**

قەدەغەیە لە یاساکاندا هیچ بڕیارێك یان کارێکی جێبەجێکردن، یان کارگێڕی لە تانووت لێدان بە دوور بێت.

**(ناشێ هیچ دەقێکی قانوونی ڕێگا لە تانەدان لە کارێك، یان بڕیارێکی کارگێڕی بگرێت).**

**ماددەی (88)**

یاسا بێ لایەنی کارگێڕی و سزادانی کەسی زێدەڕۆ لە بەکارهێنانی دەسەڵاتدا دەستەبەر دەکا.

**(قانوون بێلایەنیی دەزگاکانی بەڕێوەبردن دەستەبەر دەکات و سزای ئەو کەسانەش دەدات کە زیادەڕەوی لە بەکارهێنانی دەسەڵاتەکانیان دەکەن).**

**ماددەی (89)**

هەر کەس(ێك) لە ئاکامی ڕەفتارێکی هەڵە یان گوێ پێنەدانی کارمەندانی فەرمانگە و دەستە حکومیەکانی هەرێمی کوردستان لە کاتی ئەنجامدانی کارەکانیاندا زیانێکی پێگەیشتبێ، بۆی هەیە داوای قەرەبووکردنەوە لەو لایەنە بکات.

**ماددەی (90)**

حوکمە دادوەریەکان دەبێ جێبەجێ بکرێن و خۆ بواردن لە جێبەجێکردنیان، یان پەکخستنی جێبەجێکردنیان بە تاوان دادەنرێ و یاسا سزای لەسەر دادەنێ. ئەگەر تۆمەتبار فەرمانبەرێکی گشتی بوو یان خزمەتێکی گشتی پێ سپێردرابوو، سەرەڕای سزای تاوانەکەی، لە کارەکەشی لادەدرێ. حوکم بۆدراوەکەش مافی هەیە ڕاستەوخۆ داوا پێشکەش بە دادگای تایبەتمەند بکات و حکومەت قەرەبووی تەواوی بۆ دەستەبەر دەکا لە حاڵی زیان پێگەیشتنیدا بێ ئەوەی ئەمە بەرپرسیارێتی فەرمانبەری سەرپێچیکار لابرێت.

**(بڕیاری دادوەر جێبەجێ دەکرێت و سەرپێچی لە جێبەجێکردنی، یان دواخستنی جێبەجێکردنی تاوانە، کەسی بەرپرس بەپێی قانوون سزا دەدرێت. ئەگەر تۆمەتپێکراو کارمەندێکی گشتی بێ، یان خزمەتێکی گشتی پێ سپێردرابێت، ئەوا جگە لە سزای قانوونی، دەبێ لەسەر کارەکەشی لابرێت، کەسی بڕیاربۆدراویش دەتوانێ راستەوخۆ داوای قەرەبووکردنەوە لە دادگەی تایبەتمەند بکات، حکومەتی هەرێم بەرپرس دەبێ لە قەرەبووکردنەوەی لایەنی زیانمەند).**

## دووەم: دادگای دەستووریی کوردستان – عێراق

## (دووەم: دادگەی دەستووری لە هەرێمی کوردستان)

**ماددەی (91)**

بە یاسایەك دادگای دەستووریی کوردستان – عێراق دادەمەزرێنرێت.

**(لە هەرێمی کوردستان دادگەیەکی باڵا بە ناوی "دادگەی دەستووری" بە قانوون دادەمەزرێ).**

**ماددەی (92)**

**یەکەم:** دادگای دەستووری لە حەوت ئەندام پێکدێت بە سەرۆکەکەیەوە، کە لەنێو دادوەران و مامۆستایانی یاسا و پارێزەرانێکدا هەڵدەبژێردرێن کە سەرجەم کارکردنیان، لە بواری دادوەری، یان یاسادانان، یان وانە ووتنەوە یان پارێزەری، لە بیست ساڵ کەمتر نەبێ.

**یەکەم: (دادگەی دەستووری لە حەوت{پێنج} ئەندام پێکدێت بە سەرۆکیەوە، هەموویان لەنێو ئەو قانووونناسانە هەڵدەبژێردرێن، کە لە بواری قانوونزانیندا دیار و چالاکن، بە مەرجێك کۆی کارکردنیان لە بواری مامۆستایەتی قانوون، یان دادوەری، یان پارێزەری لە بیست ساڵ کەمتر نەبێ، ڕەچاوی مەرجی تەمەن بۆ دەستنیشانکردنیان ناکرێ).**

**دووەم:** سەرۆکی هەرێم بە ڕاوێژکردن لەگەڵ ئەنجومەنی دادوەری ئەندامانی دادگای دەستووری دەپاڵێوێ.

**(دووەم: ئەندامانی دادگەی دەستووری سەرەتا لە لایەن ئەنجومەنی دادوەری و دەستەی سەرۆکایەتی پەرلەمان دەپاڵێورێن، پاشان دادگەی دەستووری خۆی ناوی کاندیدەکان دیاری دەکات بۆ پڕکردنەوەی ئەو جێگایانەی بەتاڵ دەبن).**

**سێیەم:** ئەندامانی دادگا پاش ئەوەی پەرلەمان بە زۆرینەی دوو لەسەر سێی ئەندامەکانی ڕەزامەندی لەسەر پاڵێوراوەکان دەردەبڕێ، بە مەرسوومێك لەلایەن سەرۆکی هەرێمی کوردستانەوە دادەمەزرێن.

**ماددەی (93)**

دادگا سەرۆکەکەی لە نێو ئەندامەکانیدا هەڵدەبژێردرێ.

**ماددەی (94)**

سەرۆك و ئەندامانی دادگەی دەستووری، پێش ئەوەی دەست بە ئەرك و فەرمانەکانیان بکەن، لە بەردەم سەرۆکی هەرێمی کوردستان سوێندی یاسایی دەخۆن.

**ماددەی (95)**

دادگای دەستووری تایبەتمەند دەبێت بەم کارانەی خوارەوە:

**یەکەم:** ڕاڤەکردنی دەقی ماددەکانی دەستووری هەرێمی کوردستان.

**دووەم:**

1. چاودێری کردن بەسەر دەستووریبوونی یاساکان، لەسەر داوای سەرۆکی هەرێمی کوردستان، یان ئەنجومەنی وەزیران، یان دە کەس لە ئەندامانی پەرلەمان.
2. بڕیاردان لەسەر ڕەوایی مەرسوم و پێڕەو و ڕێنەماییەکان، لەسەر داوای هەر کەسێکی خاوەن بەرژەوەندی ڕاستەوخۆ.

**سێیەم:** یەکلا کردنەوەی دەفعێك کە پێشکەش کراوە لە داوایەکدا کە دراوەتە بەردەم دادگا سەبارەت بە دەستووری نەبوونی یاسایەك، یان ڕەوانەبوونی بڕیارێك، یان پێڕەوەێك، یان ڕێنماییەك. دادگاش دەبێ داوایەکە دوابخات تا ئەو کاتەی ئاکامی دەفعەکە یەکلا دەکرێتەوە.

**(سێیەم: یەکلاکردنەوەی ئەو تانانەی لە داوایەکدا پێشکەش بە دادگە کراون سەبارەت بە نادەستووریبوونی قانوونێك، یان ناڕەوابوونی بڕیار، یان پەیرەو یان ڕێنوێنییەك، لەم حاڵەتەدا دەبێ دادگەی بابەتەکە سەیرکردنی داواکە دوابخات تا ئەنجامی ئەو تانەلێدانە یەکلا دەکرێتەوە).**

**چوارەم:** پەسندکردنی ئەنجامەکانی ڕاپرسی و هەڵبژاردنەکانی گشتی بۆ سەرۆکی هەرێم و پەرلەمانی کوردستانی - عێراق.

**پێنجەم:** یەکلاکردنەوەی دەستووریبوونی ئەو هەموارکردنەی پێشنیازدەکرێ بۆ دەستووری هەرێم کوردستان و گونجاوبوونی لەگەڵ مەرجەکانی ماددەی (120)ی ئەم دەستورە.

**(ئەم بڕگەیە لە کۆبوونەوەی لیژنەی دەستووری کە لە مانگی تەمووزی 2008دا بەسترابوو، خراوەتە سەر پرۆژەکە).**

**شەشەم:** دادگایی کردنی سەرۆك یان جێگری سەرۆکی هەرێمی کوردستان، پاش ئەوەی بەپێی ماددەی (62)ی ئەم دەستوورە لە لایەن پەرلەمانەوە تۆمەتیان دەدرێتە

پاڵ. بۆ بەتاوانبارکردنی سەرۆك یان جێگرەکەی، پێویستە بەلای کەم پێنج ئەندامی دادگا ڕەزامەندی لەسەر بدەن.

**(بڕگەیێکی تازەیە لە کۆبوونەوەی لیژنەی دەستووری لە مانگی تەمووزی 2008دا خراوەتە سەر پرۆژەکە).**

**حەوتەم:** یەکلاکردنەوەی ئەو داوایانەی کە بەپێی ماددەی (19/ بڕگەی هەژدەهەم/ 3)ی ئەم دەستوورە بەرزدەکرێتەوە.

**(بڕگەیێکی تازەیە، لە کۆبوونەوەی مانگی تەمووزی 2008دا خراوەتە سەر پرۆژەکە).**

**هەشتەم:** یەکلاکردنەوەی ئەو تانووتانە کە پێوەندیان بە دروستیی ئەندامەتی ولابردنی پارێزراوەیی (حصانە) لەسەر ئەندامی پەرلەمانەوە هەیە.

**ماددەی (96)**

مەرجەکانی ئەندامەتیی لە دادگا و ڕەوتی کار تێداکردنیان و چۆنیەتی وەرگرتنی داواکاری و داخوازیەکان و تانووتەکان بە یاسایەك ڕێکدەخرێت.

**ماددەی (97)**

حوکمەکانی دادگای دەستووری بنەڕەتین و لەسەر هەمووان جێبەجێ دەکرێن. ئەگەر دادگا لە کاتی یەکلاکردنەوەی دەستووریبوونی یاسایەکان، یان ڕەوایبوونی مەرسوم و پێڕەو و بڕیار و ڕێنماییەکان، بڕیاری دا کە هەر کام لەوانە پێچەوانەی دەستوور یان یاسایە، دەبێ دەسەڵاتی پەیوەندیدار لە هەرێمی کوردستان ئاگادار بکاتەوە تا هەرچی پێویستە ئەنجامی بدا بۆ لابردن، یان ڕاستکردنەوەی سەرپێچیەکان.

### سێیەم: ئەنجومەنی دادوەری

**ماددەی (98)**

**یەکـەم:** ئەنجومـەنی دادوەری لـە سـەرۆکی دادگـای پێداچـوونەوە و جێگرەکـانی و سـەرۆکی دەسـتەی سەرپەرشـتی دادوەری، و سـەرۆکی داواکـاری گـشتی و سـەرۆکەکانی دادگاکانی تێهەڵچوونەوەی ناوچەکانی هەرێمی کوردستان پێکدێ.[1]

**(یەکەم: ئەنجومـەنی دادوەری لـە هـەرێمی کوردسـتان سـەربەخۆیە، لـە دادگـەی دەستووری و دادگەی پێداچوونەوە ( تـەمییز) و ئەنجومـەنی ڕاوێـژکاری (شـورا) و دەستەی سەرپەرشتی دادوەری و سەرۆکی داواکاری گشتی و سەرۆکەکانی دادگەکانی تێهەڵچوونەوە لە ناوچەکانی هەرێمی کوردستان پێکدێت، شێوەی پێکهێنانی و مەرج و کارڕایی دامەزراندنی ئەندامانی و بەرپرسیارێتییان بە قانوون ڕێك دەخرێن).**

**دووەم:** ئەنجومـــەنی دادوەری، بـــەپێی یاســـا، بەڕێوەبـــەردنی دادوەریـــی و دەستەبەرکردنی سەربەخۆییەکەی و چاودێریی دەستەکانی دادوەری لە ئەستۆ دەگرێ.

**ماددەی (99)**

**یەکـەم:** دەسـەڵاتی دادوەری بودجـەی تایبـەتی هەیـە کـە بـە بودجـەی هەرێمـەوە دەلکێندرێ و پێکدێ لەو ڕەسم و غەرامانەی کە بەپێی یاسا وەردەگیرێ و لـەو پارەیـەی حکومەتی هەرێم بۆی تەرخان دەکا.

**دووەم:** ئەنجومـەنی دادوەری ئامـادە کردنـی پـرۆژەی بودجـەی ساڵانەی دەسـەڵاتی دادوەری لە ئەستۆدەگرێ و لەگەڵ وەرگرتنی بیروڕای دادگای دەسـتووری سـەبارەت بـەو پارە تایبەتەی بۆی تەرخان کراوە و دەیخاتە بەرچاوی پەرلەمانی کوردسـتان – عێـراق بۆ پەسەندکردنی، بە مەرجێ دوا ژمارەی بخرێتە نێوبودجەی ساڵانەی هەرێمەوە.

---

[1] لە کۆبوونەوەی لیژنەی دەستووری کە لە مانگی تەمووزی 2008دا بەستراوە ئەم ماددەیـە دەسـتکاری کـراوە، چونکە لەو پرۆژەی کە لە مانگی حوزەیرانی 2006دا ئامـادەکرابوو، سـەرۆکی دادگـەی دەسـتووری بـە حـوکمی قانوون دەبووە سەرۆکی ئەنجومەنی دادوەری، وەکو لە دەستووری عێراقدا هاتووە.

**(دووەم: ئەنجومەنی دادوەری ساڵانە پرۆژەی بودجەی دەسەڵاتی دادوەری ئامادە دەکات و دەیخاتە بەردەم پەرلەمانی کوردستان، تا بڕیاری لەسەربدات، بەمەرجێك ژمارە کۆتاییەکەی لە ناو بودجەی ساڵانەی هەرێمدا بێت).**

## دەروازەی چوارەم [1]

### یەکەم: داواکاری گشتی

**ماددەی (100)**

داواکاری گشتی نوێنەرای کۆمەڵە، بۆ بەرگریکردن لە دادپەروەری و پاراستنی ڕەوایی (مشروعیە) وسیستەمی گشتی و ئاسایشی هەرێم و دارایی گشتی و پاراستنی خێزان و تاکە کەسان و ئازادیەکانیان. ئەمەش بە یاسا ڕێکدەخرێ.

**(داواکاری گشتی نوێنەرایەتی کۆمەڵ لە هەرێمی کوردستان دەکات و بە ناوی ئەویشەوە داوای گشتی بۆ بەرگریکردن لە مافی گشتی و چەسپاندنی داد دەکات، لەگەڵ چاودێری جێبەجێکردنی قانوونی سزادان و سەرپەرشتیی کاروباری ڕێکاری دادوەری و چاودێری پێشێلکارییەکانی قانوون و چۆنیەتی جێبەجێکردنی بڕیار و سزاکان).**

### دووەم: ئەنجومەنی شووڕا

### پێنجەم: ئەنجومەنی ڕاوێژکاری (شورا)

**ماددەی (101)**

ئەنجومەنی شووڕای هەرێمی کوردستان – عێراق دادەمەزرێندرێ و ئەرك و فەرمانەکان و دەسەلاًت و پێکهاتەکانی بە یاسایەك ڕێکدەخرێ.

**(ئەنجومەنی ڕاوێژکاری (شورا)ی هەرێمی کوردستان، کە بە قانوون پێکدەهێنرێت، تایبەتمەند دەبێ بەم ئەرکانەی خوارەوە:**

---

[1] دەبوو ئەم دەرواازە، وەکو دەروازەکانی تر، ناونیشانی تایبەتی بۆ دابنرێ.

**یەکەم: یەکلاییکردنەوەی ئەو تانانەی تایبەتن بە کارڕایی تەمێکردن و دیسپلین و هەموو کارێك پەیوەندیی بە ئەرك و خزمەتی فەرمانبەرانەوە هەیە لە دەزگاکانی حکومەتدا.**

**دووەم: یەکلاییکردنەوەی کێشەی دەستدارێتی (تنازع الاختصاص) لە نێو وەزارەت و دامەزراو و دەزگاکانی حکومەتی هەرێم، لەسەر داوای سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.**

**سێیەم: ئامادەکردن و داڕشتنی پرۆژەی قانوون لە هەرێمی کوردستان، لەسەر داوای سەرۆکی هەرێم، یان ئەنجومەنی وەزیران، یان وەزارەتێك، یان ئەو لایەنانەی بە وەزارەتێکی تایبەتەوە نەبەستراونەتەوە.**

**چوارەم: ڕادەربڕین سەبارەت بەو کێشە قانوونییانەی لە لایەن وەزارەت و ئەو لایەنانەی بە وەزارەتێکەوە نەبەستراونەتەوە، کە دەخرێنە بەرچاوی و یەکلاکردنەوەی ئەو پرسانەی کێشەیان لەسەرە و هەردوو لایەنی پەیوەندیدار داوای یەکلاکردنەوەیان کردووە.)**

## دەروازەی پێنجەم
## کارگێڕیە خۆجییەکان و ئەنجومەنەکانی شارەوانی
## (بەڕێوەبەرایەتی خۆجەیی و ئەنجومەنی شارەوانی)

**ماددەی (102)**

دابەش بوونی کارگێڕی لە هەرێمی کوردستان لەسەر بناغەی (پارێزگا، قەزا، ناحیە، دێ) دەبێ و کردنەوە و دیارکردن و گۆڕینی مەڵبەندەکانیان (مرکز) و دیارکردن و هەموارکردنی سنوورەکانیان و لێك کردنەوە و لکاندنیان بە یەکەکانی دیکەی کارگێڕیەوە بەپێی یاسا دەبێ.

**(دابەشکردنی یەکەکانی بەڕێوەبەرایەتی هەرێمی کوردستان کە لەسەر بنەمای پارێزگا، قەزا و ناحیە پێکهێنراون و دەستنیشانکردن و گۆڕینی ناوەندەکانیان و دیاریکردن و گۆڕینی سنووریان، لەگەڵ لێکدابڕان و لکاندنیان بە یەکەیەکی بەڕێوەبەرایەتی دیکەوە، ئەویش بە قانوون ڕێك دەخرێت).**

**ماددەی (103)**

**یەکـەم:** لـە بـەڕێوەبردنی یەکـە کارگێڕیـەکان لـە هـەرێمی کوردسـتان – عێراقـدا، (پارێزگا، قەزا، ناحیـە، دێ) و لـە گەشـەپێدان و کـارا کردنیـان بەشـێوەیەکی بـەردەوام، بنەمای نامەرکەزی دەگرێتەبەر، وەك یەکێك لـە شـێوازە پێویـستەکانی بەشـداریکردنی هاووڵاتیـانی هـەرێمی کوردسـتان – عێـراق لەبـەڕێوەبردنی کاروبـاری گـشتیی یەکـە کارگێڕیەکاندا بۆ وەدیهێنانی دیموکراسی. هەر یەك لەمانـەش ئەنجومـەنێکی خۆجـەیی دەبێ، کە بە دەنگدانی گشتیی، نهێنی و ڕاستەوخۆ هەڵدەبژێردرێ. بە یاسایەك شـێوەی هەڵبژاردنەکەی و دەسەڵات و ئەرك و فەرمانەکانی دیاردەکرێن.

**(یەکەم: بەڕێوەبردنی یەکە بەڕێوەبەرایەتییەکانی هەرێمی کوردستان (پارێزگا، قـەزا، ناحیـە) لەسـەر بنـەمای ناناوەنـدیی بەڕێوەبەرایـەتی (لامەرکەزییـەت)، کـە هەریەکەیان ئەنجومەنێکی خۆجێیی هەڵبژێردراوی خۆی دەبێ، کە  بە هەڵبژاردنێکی گشتی و نهێنی و راستەوخۆ دەستنیشان دەکرێن، شێوەی هەڵبـژاردن و دیـاریکردنی ئەرك و دەسەڵاتەکانیان بە قانوون ڕێك دەخرێت).**

**دووەم:** هەر یەکەیەکی کارگێڕی ئەنجومەنێکی جێبەجێ کردنی دەبـێ کـە سـەرۆکی یەکـە کارگێڕیەکـە سـەرۆکایەتی دەکـاو چـۆنیەتی پێکهێنـانی و دیـارکردنی دەسـەڵات و ئەرکو فەرمانەکانی و پەیوەندیی بە ئەنجومەنی خۆجەیی کارگێڕیەکە بە وەزارەتـەکان و دامودەزگا ناوەندیەکان لە هەرێمی کوردستانەوە بە یاساڕێك دەخرێ.

**(دووەم: هەموو یەکەیەکی بەڕێوەبەرایەتی لە هەرێمی کوردستان ئەنجومەنێکی ڕاپەڕاندنی دەبێ بـە سـەرۆکایەتی سـەرۆکی یەکـە بەڕێوەبەرایەتییەکـەی، شـێوەی دامەزراندن و دیاریکردنی دەسەڵات و ئەرکەکانی و پەیوەندی بە ئەنجومەنی خۆجێیی یەکە بەڕێوەبەرایەتییەکە و وەزارەت و دەزگاکانی ناوەندیی کوردستان، بە قـانوون دیاری دەکرێن).**

**ماددەی (104)**

مەڵبەندی هەر پارێزگاو قەزاو ناحیەك و هەر دێیەکیش کە ژمارەی دانیشتوانی لـە سێ هەزار کەس کەمتر نەبێ شارەوانیەکی دەبـێ کـە ئەنجومـەنێکی شـارەوانی بـەڕێوەی دەباو بەپێی یاسا خزمەتە گشتیەکان پێشکەش بە هاوولاتیانی دەکا.

**(له ناوەندی هەر پارێزگا، قەزا، ناحیە و هەر گوندێك، كە ژمارەی دانیشتوانی لە سێ هەزار(3000) كەس كەمتر نەبێ، شارەوانییەكی دەبێ، ئەركەكانی بەپێی قانوون دیاری دەكرێن بۆ پێشكەشكردنی خزمەتگوزاریی گشتی بۆ هاوولاَتییانی، ئەنجومەنێكی شارەوانی هەڵبژێردراو بەڕێوەیان دەبات).**

**ماددەی (105)**

**یەكەم:** ئەنجومەنی خۆجێی و شارەوانییەكان خاوەنی كەسایەتی مەعنەوین.

**(یەكەم: ئەنجومەنی پارێزگا و شارەوانی كەسایەتیی مەعنەویی خۆیان هەیە).**

**دووەم:** هەر یەكەیەكی كارگێڕی، یان شارەوانی بودجەیەكی سەربەخۆو تایبەتی دەبێ.

**(دووەم: هەموو یەكەیەكی بەڕێوەبەرایەتی و شارەوانی، بودجەی سەربەخۆی خۆی هەیە).**

**ماددەی (106)**

**یەكەم:** لە پێكهێنانی ئەنجومەنە خۆجێییەكان و شارەوانییەكاندا نوێنەرایەتیەكی دادپەروەرانەی پێكهاتەكانی ئەو یەكە كارگێڕیە، یان شارەوانیە لەبەرچاو دەگیرێ و ئەمەش بە یاسا ڕێكدەخرێ.

**(یەكەم: لە پێكهێنانی ئەنجومەنی پارێزگا و شارەوانییەكاندا پێویستە نوێنەرایەتیكردنی دادپەروەرانە بۆ ئەو نەتەوانەی لەو یەكە بەڕێوەبەرایەتییە، یان شارەوانییە دەژین ڕەچاو بكرێت، ئەویش بە قانوون ڕێك دەخرێت).**

**دووەم:** پێویستە یاسای هەڵبژاردنی ئەنجومەنە خۆجێیەكان و وەدیهێنانی بەلای كەم 30٪ ژمارەی ئەندامانیان بۆ ژنان وەك ئامانجێك لەبەرچاو بگرێ.

**(دووەم: لە قانوونی تایبەت بە هەڵبژاردنی ئەنجومەنە خۆجێییەكان دەبێ ڕێژەی لە (30٪) لە ژمارەی ئەندامانیان بۆ ژنان بن).**

## دەروازەی شەشەم

### دەستە و کۆمسیۆنە سەربەخۆیەکان

**ماددەی (107)**

**یەکەم:** بە یاسایەك ئەمانەی خوارەوە دادەمەزرێن:

1- دەستەی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردن و ڕاپرسی لە کوردستان – عێراقدا.

2- دیوانی دەستپاکی و چاودێری دارایی.[1]

3- دەستەی گشتی دروستی و باشیی بەرهەمەکانی خۆماڵی و هاوردەکان.

**دووەم:**

1- بە یاسایەك ئەنجومەنی ڕاوێژکار بۆ کاروباری ئابووری و کۆمەڵایەتی دادەمەزرێت.

2- ئەرکی ئەو ئەنجومەنە پێشکەشکردنی ڕاوێژە بە هەریەك لە سەرۆکایەتی هەرێم و پەرلەمان و ئەنجومەنی وەزیران لە بواری کاروباری ئابووری و کۆمەڵایەتیدا.

**(ماددەی (107)**

**(یەکەم: ئەم دەستە و کۆمیسیۆنانەی خوارەوە بەپێی قانوون دادەمەزرێن:**

**1- دەستەی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردن لە هەرێمی کوردستان.**

**2- دیوانی چاودێریی دارایی.**

**3- دەستەی گشتی دەستپاکی.**

**4- کۆمیسیۆنی پاراستنی مافی مرۆڤ.**

**5- کۆمیسیۆنی تایبەت بە مافەکانی کوردی فەیلی.**

**6- دەستەی گشتی بۆ سەلامەتی و چاکیی بەرهەمی خۆماڵی و هاوردە.**

**7- دەستەی سەربەخۆی هەرێمی کوردستان بۆ ڕاگەیاندن و پێوەندیکردن.**

**8- دەستەی پاراستنی ژینگە لە هەرێمی کوردستان.**

**9- دەستەی خانمان لە هەرێمی کوردستان.**

---

[1] کۆکردنەوەی ئەو دوو دەستەیە: ( دەستپاکی و چاودێری دارایی) لە یەك دەستەدا، بە پێچەوانەی قانوونە، چونکە ئەرکەکانیان جیاوازن و یەکێکیان چاودێری کارەکانی ئەوی تر دەکات، دەبێ دوو دەستەی سەربەخۆ بن.

**دووەم: پێكهێنانی ئەم ئەنجومەنانەی خوارەوە بە قانوون ڕێك دەخرێت:**

**1- ئەنجومەنی راوێژكاری بۆ كاروباری دارایی و كۆمەڵایەتی.**

**2- ئەركی ئەم ئەنجومەنە پێشكەشكردنی ڕاوێژكارییە لە ڕووی كاروباری دارایی و كۆمەڵایەتییەوە بۆ سەرۆكایەتی هەرێم و پەرلەمانی كوردستان و ئەنجومەنی وەزیران).**

**ماددەی (108)**

**یەكەم:** ئەو دەستانەی كە بڕگەی (یەكەم)ی ماددەی (107)ی ئەم دەستوورە دەیانگرێتەوە لەژێر چاودێری پەرلەمانی كوردستان – عێراقدا دەبن و یاسا پەیوەندی هەر یەكێكیان بە پەرلەمانەوە ڕێكدەخات.

**(یەكەم: ئەو دەستەو كۆمیسیۆنانەی بەپێی بڕگەی یەكەمی ماددەی سەد و حەوت دادەمەزرێن، لەژێر چاودێریی پەرلەمانی كوردستان دەبن، كە بە قانوون ڕێك دەخرێت).**

**دووەم:** بێجگە لەوانەی لە بڕگەی (یەكەم)ی ماددەی (107)ی ئەم دەستوورەدا هاتوون، دەكرێ دەستە و كۆمسیۆنی دیكەش بە یاسا پێكبهێندرێ.

**ماددەی (109)**

ئەنجومەنێك پێكدەهێنرێت بەناوی (ئەنجومەنی ئاسایشی هەرێم) و پەیوەست دەبێ بە سەرۆكی هەرێمەوە و پێكهاتەو ئەو كۆفەرمان و تایبەتمەندی و دەسەڵاتەكانی بە یاسایەك ڕێكدەخرێن.

**(ئەم ماددەیە لە كۆبوونەوەی لیژنەی دەستووری لە مانگی تەمووزی 2008دا خراوەتە سەر پرۆژەكە، لەو پرۆژەی كە لە حوزەیرانی 2006دا ئامادەكرابوو، ئاماژەی تێیدا بۆ نەكرابوو).**

## دەروازەی حەوتەم

## حوكمە داراییەكان

**ماددەی (110)**

ئەو کەسانەی خاوەن داهاتی نزمن لە باج دەبەخشرێن، بـە جۆرێـك نـزمترین ڕادەی دادپەروەریی گوزەران دەستەبەر بکات، ئەمەش بە یاسایەك ڕێکدەخرێت.

**(ماددەی (110)**

**یەکەم: دانانی باج، یان فەرمانە (ڕەسم) و دەستکاریکردنیان و لابردنیان بە قانوون دەبێ، کەسێك نابێ داوای ئەرکێکی لێ بکرێت ئەگەر بە قانوون نەبێ.**

**دووەم: کەسانی کەم دەرامەت لە باجدان دەبووردرێن، تا ژیانێکی ئاسـاییيان بـۆ مسۆگەر بکرێت، ئەویش بە قانوون ڕێك دەخرێت).**

**ماددەی (111)**

داهاتی هەرێمی کوردستان پێکدێت لە:

**یەکـەم:** بەشـی هـەرێم لـە بوودجـەی گـشتی حکومـەتی فیـدراڵ لـە دەسـکەوتەکانی سامانی نەوت و گاز و رەسم و گومرگ و داهاتە فیدراڵیەکانی دیکە، بە قەرز و بەخشین و هیبەو یارمەتیەکانیشەوە.

**دووەم:** دەسـکەوتەکانی بـاج و رەسـم و کرێیـەکانی راژەی دامودەزگـا گـشتیەکان و داهاتەکانی دامەزراوو کۆمپانیا گشتیەکان.

**سێیەم:** ئەوەی وەردەگیرێت لە کرێیەکانی (بەڕێوەبردنو کۆکردنەوەی باج و رەسم و گومرگە فیدراڵیەکان و داهاتە فیدراڵیەکانی دیکە لە هەرێمدا).

**چوارەم:** دەسکەوت و داهاتەکانی وبەرهێنانی حکومەتی هەرێم.

**پێنجەم:** بەخشش و هیبەکان.

**شەشەم:** قەرزە نێوخۆیی و دەرەکیەکانی تایبەت بە هەرێم.

**حەوتەم:** ئـەو پـشتیوانە داراییـەی کـە حکومـەتی فیـدراڵ پێـشکەش بـە حکومـەتی هەرێم دەکا.

**(ماددەی (111)**

**داهاتەکانی هەرێمی کوردستان لەو سەرچاوانەی خوارەوە پێکدێن:**

**یەکـەم: دەسـکەوتی بـاج و فەرمانــە (ڕەسـم) و کرێـی خزمـەتگوزاریی شـوێنە گشتییەکان و داهاتی دەزگا و کۆمپانیا و بەرژەوەندییەکانی گشتی لە هەرێم، لەگەڵ**

**خەرجیی وەرگرتن و بەڕێوەبردن و کۆکردنەوەی باج و فەرمانە (ڕەسم)ی گومرك و هی تر، کە داهاتی حکومەتی یەکگرتوون لە هەرێمی کوردستان.**
**دووەم: دەسکەوتی وەبەرهێنانی سامان و کەرەستە خاوەکانی سروشتی لە هەرێم.**
**سێیەم: بەخشراو و دیارییانەی بە حکومەتی هەرێم دەدرێن.**
**چوارەم: قەرزە ناوخۆیی و دەرەکییەکانی تایبەت بە هەرێمی کوردستان.**
**پێنجەم: بەشی هەرێم لە دەسکەوتی سامانی نەوت و گاز و فەرمانە (ڕەسم)ی گومرگ و داهاتەکانی دیکەی فیدرالی).**

**ماددەی (112)**

سالّی دارایی بە یاسا دیاری دەکرێ.

**(سالّی دارایی بە قانوون دیاری دەکرێت).**

**ماددەی (113)**

**یەکەم:** هەموو سالّێکی دارایی یاسای بودجەی هەرێم دادەنرێت و داهاتو خەرجیە خەملّێنداراوەکانی لەخۆدەگرێت.

**دووەم:** سێ مانگ پێش تەواوبوونی سالّی دارایی، پرۆژە یاسای بودجەی سالّی دارایی دەدرێتە پەرلەمانی کوردستان – عێراق.

**سێیەم:** ئەگەر لەبەر هەر هۆیەك، ئامادەکردن، یان پێشکەش کردنی بودجە کەوتە دوای دەستپێکی سالّی دارایی حکومەتی هەرێمەوە، ئەوا بۆ هەر مانگێك کە بودجەکەی دواکەوتوە ڕێژەی (1/ 12)ی ئەو پشتەوانیەی کە بۆ سالّی دارایی ڕابوردوو بڕیاری لەسەردرابوو خەرج دەکرێت.

**(ماددەی (113)**

**یەکەم: لە هەموو سالّێکی داراییدا قانوونێکی تایبەت بە بودجەی هەرێمی کوردستان لەلایەن پەرلەمانەوە پەسند دەکرێت، تێیدا داهات و خەرجییە خەملّێنراوەکان لەخۆدەگرێت.**

**دووەم: پرۆژەی بودجەی سالّی دارایی سێ مانگ پێش کۆتایی سالّی دارایی دەبێ پێشکەش بە پەرلەمان بکرێت.**

**سێیەم: لە حاڵەتی دواکەوتنی ئامادەکردنی ئەو پرۆژەیە، یان پێشکەشکردنی پرۆژەی بودجەی هەرێم لە سەرەتای ساڵی داراییدا لەبەر هەر هۆیەك بێت، حکومەتی هەرێم بۆ هەر مانگێك بە ڕێژەی 1/ 12 ئیعتمادی پەسندکراوی بودجەی ساڵی دارایی پێشوو خەرج دەکات).**

**ماددەی (114)**

**قەدەغەیە سەرۆکی هەرێمی کوردستان و جێگرەکەی و سەرۆکی پەرلەمانی کوردستان و جێگرەکەی و ئەندامانی پەرلەمان و سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و جێگرەکانی و وەزیرەکان و ئەوانەی پلەی تایبەتیان هەیە و دادوەرەکان و داواکارە گشتیەکان و جێگرەکانی داواکاری گشتی و بەڕێوەبەریە گشتیەکان ئەوانە لە پلەی ئەوان دا، شتێك لە سامانە گشتیەکانی هەرێمی کوردستان – عێراق بکڕن، یان بە کرێی بگرن، یان شتێك لە موڵکی خۆیان بە دەسەڵاتەکانی هەرێم بفرۆشن یان بە بەکرێ بدەن یان گرێبەستێك مۆر بکەن بەناوی ملتزم (پابەند)، یان هاوردەکار، یان بەڵێندەر، ڕاستەوخۆ یان بە هۆی کەسێکی دیکەوە.**

**(ماددەی (114)**

**سەرۆکی هەرێم و جێگرەکەی و سەرۆکی پەرلەمانی کوردستان و ئەندامانی پەرلەمان و سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و جێگرەکەی و وەزیرەکان و دادوەر و داواکارانی گشتی و جێگرەکانیان و خاوەن پایە تایبەتەکان و بەڕێوەبەرایەتی گشتی و ئەوانەی پایەی ئەوانیان هەیە، نابێ شتێك لە سامانی گشتی بکڕن، یان بە کرێی بگرن، یان شتێکی خۆیان بەکرێ بە دەزگایەکی حکومەتی بدەن، یان پێی بفرۆشن، یان ڕێککەوتنی ڕاستەوخۆ، یان بە هۆی کەسێکیکەوە لەگەڵیا ببەستن، یان پابەند بن وەك هێنەر، یان بەڵێندەر).**

## دەروازەی هەشتەم

### کارپێکردنی دەستوور و لێکدانەوە و هەموارکردنی

**ماددەی (115)**

کار به هیچ هەموارکردنێکی دەستووری فیدراڵی ناکرێ ئەگەر لەو تایبەتمەندیانەی دەسەڵاتەکانی هەرێمی کوردستان کەم بکاتەوە کە ناکەونە نێو دەسەڵاتە تایبەتیەکانی (حصری) فیدراڵی، هەتا ڕەزامەندی پەرلەمانی هەرێم و ڕەزامەندی زۆرینەی دەنگدەرانی گەلی کوردستان – عێراق لە ڕاپرسیەکدا لەسەر نەبێ، بەپێی حوکمی ماددەی (126/ چوارەم) لە دەستووری فیدراڵی.

**(ماددەی (115)**

**کار بە دەقێکی دەستوور، یان قانوونێکی فیدرالی ناکرێت، کە لە دەسەڵاتە تایبەتمەندییەکانی دەسەڵاتی یەکگرتوو نەبێت و ببێتە هۆی کەمکردنەوەی دەسەڵاتەکانی هەرێمی کوردستانی – عێراق، مەگەر پەرلەمانی هەرێم پەسندی بکات و گەلی هەرێمی کوردستان لە راپرسییەکی گشتیدا بە زۆرینەی دەنگی بەشداربووان دەنگی بۆ بدات).**

**ماددەی (116)**

تا ئەو کاتەی دادگای دەستووری لە کوردستان پێکدێ، دادگای پێداچوونەوەی کوردستان بێجگە لە تایبەتمەندیە ئاساییەکانی، تایبەتمەند دەبێت بە لێکدانەوەی دەقەکانی ئەم دەستوورە و بڕیاردان لەسەر دەستوورینەبوونی یاساکان و ڕەوانەبوونی بڕیار و مەرسووم و پێڕەو و ڕێنماییەکان لەو داوایانەی دەخرێنە بەردەم دادوەری.

**(ماددەی (116)**

**دادگەی پێداچوونەوە "تەمییز"ی هەرێمی کوردستان، جگە لە تایبەتمەندییە ئاساییەکانی خۆی، دەقەکانی ئەم دەستوورە لێکدەداتەوە و نادەستووریەتی قانوون و بڕیار و پەیڕەو و ڕێنماییەکان لەو داوایانەی خراونەتە بەردەم دادگە ڕادەگەیەنێت، تا دادگەی دەستووری لە هەرێمی کوردستان دادەمەزرێت).**

**ماددەی (117)**

یاساکان لە رۆژنامەی رەسمیی هەرێمی کوردستان (وەقائعی کوردستان)دا بڵاودەکرێنەوە و لە ڕۆژی بڵاوبوونەوەیان کاریان پێ دەکرێ، مەگەر دەقێکیان بە پێچەوانەی ئەمەوە بێت.

**(ماددەی (117**

**قانوون لە ڕۆژنامەی فەرمیی هەرێمی کوردستان (وەقائعی کوردستان){ هەرێمی کوردستان} بڵاودەکرێتەوە، لە ڕۆژی بڵاوکردنەوەیدا کاری پێدەکرێت، مەگەر دەقێك بە پێچەوانەی هاتبێت).**

**ماددەی (118)**

ئەم دەستووره، پاش ڕەزامەندیی زۆرینەی دەنگدەرانی گەلی هەرێمی کوردستان لە ڕاپرسیەکی گشتیدا، بە پەسندکراو دادەنرێ.

**ماددەی (119)**

ئەگەر زنجیرەی ئەو ماددانەی دەستووری فیدراڵی کە لەم دەستوورەدا پشتیان پێوە بەستراوە، هەموارکرا، پەرلەمان بۆی هەیە بە زۆرینەی دەنگی ئامادەبووان ئەو زنجیرەیە ڕاست بکاتەوە کە پشتی بە پێ بەستراوە.

**(ماددەی (119**

**ئەم ماددەیە لە کۆبوونەوەی لیژنەکە لە مانگی تەمووزی 2008دا خراوەتە سەر پرۆژەکە، لە ڕووی زمانەوانییەوە دەبێ دابڕێژرێتەوە).**

**ماددەی (120)**

**یەکەم:** ئەم دەستووره هەموار ناکرێ بەبێ ئەو ڕێکارانەی لەم ماددەیەدا هاتوون، بەمەرجی زیان بە سەلامەتی سیستەمی سیاسیی، پەرلەمانیی کۆماریی دیموکراتیی کوردستانی – عێراق و سەلامەتی خاکەکەی نەگەیەنێ و لەو ماف و ئازادیانەی لەم دەستوورەدا هاتوون کەم نەکاتەوە.

**دووەم:** سەرۆکی هەرێمی کوردستان و ئەنجومەنی وەزیران پێکەوە، یان سێ یەکی ژمارەی ئەندامانی پەرلەمان بۆیان هەیە پێشنیازی هەموارکردنی دەستوور بکەن.

**سێیەم:** دادگای دەستووری، پاش پێداچوونەوەی هەموارکردنی پێشنیازکراو، دەبێ لە ماوەی چل و پێنج ڕۆژدا بڕیار بدات کە هەموارکردنە پێشنیازکراوەکە ناکۆکە لەگەڵ ئەو مەرجانەی لە بڕگەی یەکەمی ئەم ماددەیەدا هاتوون، یان نا.

**چوارەم:** پەرلـەمانی کوردسـتان – عێـراق بـۆی هەیـە بـە زۆرینـەی 3/2ی ژمـارەی ئەندامەکانی ڕەزامەندی لەسەر پێشنیازەکە دەربڕێت.

پێنجەم: گەلی کوردستان – عێراق لە ڕاپرسیەکی گشتیدا، بـە زۆرینـەی دەنگـدەران ڕەزامەندی لەسەر هەموارکردنەکە دەدات.

**(ماددەی (120)**

**یەکـەم: سـەرۆکی هـەرێم و ئەنجومـەنی وەزیـران پێکـەوە، یـان نیـوەی ژمـارەی ئەندامانی پەرلەمان دەتوانن داوای هەموارکردنی ئەم دەستووورە بکەن، بە مەرجێك ئـەو هەموارکردنــە نەبێتــە هــۆی دەســتکاریکردنی سیــستمی کۆمــاریی پەرلــەمانی دیموکراتی لە هەرێم و گۆڕینی یەکیەتیی خاکەکەی.**

**دووەم: پەرلەمانی کوردستان – عێراق بە ڕێژەی دوو لەسەر سێی (3/2) ژمارەی ئەندامانی بڕیار لەسەر پێشنیازەکە بدات.**

**سێیەم: ئەو کەسانەی کە مافی دەنگدانیان لە هەرێمدا هەیە دەبێ بە زۆرینە لە ڕاپرسییێکی گشتیدا دەنگ بۆ ئەو هەموارکردنە بدەن.**

**چوارەم: دوای تێپەڕبوونی شەست ڕۆژ بەسەر پەسندکردنی ئەو هەموارکردنە لە لایەن گەلی هەرێمی کوردستانەوە، دەبێ جێبەجێ بکرێت).**

**ماددەی (121)**

ڕاپرسی مـافێ هاولاتیـانی هەرێمـە و (%25) ی ئەوانـەی مـافی دەنگـدانیان هەیـە لـە هەرێم دا دەتـوانن لەسـەر بابـەتێکی دیـارکراو داوای ڕاپرسـی بکـەن، بـە مـەرجێك ئـەم ڕاپرسیە بەپێی یاسا ڕێکبخرێ و جێ بەجێبکرێ.

**(ماددەی (121)**

**ڕاپرسی مافێکی ڕەوای هاوولاتییانە لە هەرێمی کوردستان، ئەگەر لە (%25) ی ئەو کەسانەی مافی دەنگدانیان لە هەرێم هەیە داوای ڕاپرسی بۆ بابەتێکی دیاریکراو بکەن، دەبێ ئەنجام بدرێت، ئەوەش بە قانوون ڕێك دەخرێت).**

**ماددەی (122)**

**یەکەم:** ئەم دەستوورە، سی (30) رۆژ دوای ئەوەی لە ڕاپرسیەکی گشتیدا ڕەزامەندی لەسەر دەدرێت، بە کارپێکراو دادەنرێت و سەرۆکی هەرێمی کوردستان، لە ماوەی دە رۆژ دوای ڕەزامەندی لەسەردانی لە ڕاپرسیە گشتیەکەدا، بلاّوکردنەوەی لە رۆژنامەی فەرمی (وەقائیعی کوردستان) لە ئەستۆ دەگرێ.

**دووەم:** ئەو یاسایانەی لە رۆژی کارپێکردنی ئەم دەستوورەدا کاریان پێکراوە، ئەگەر بەپێ حوکمەکانی ئەم دەستووره هەموار نەکرێن، یان هەڵنەوەشابنەوە، بە کارپێکراو دەمێننەوە.

**(ماددەی (122)**

**(یەکەم: لە ڕۆژی پەسندکردنی ئەم دەستوورە لە ڕاپرسییێکی گشتیدا جێبەجێ دەکرێ، سەرۆکی هەرێم بۆ ماوەی دە (10) رۆژ لە ڕۆژنامەی فەرمی (وەقائیعی کوردستان){ هەرێمی کوردستان} بلاّوی دەکاتەوە.**

**(بڕگەی دووەمی ئەم ماددەیە لە کۆبوونەوەی مانگی تەمووزی 2008دا خراوەتە سەر پرۆژەکە. لە ڕووی قانوونییەوە نادروستە، چونکە قانوونی وا لە هەرێمی کوردستان ئێستا کاریان پێ دەکرێت، پاش پەسندکردنی ئەم دەستوورە ناگونجێن لەگەڵ بەشێك لە ماددەکانی. چاکترە دادگەی دەستووری بڕیار لەسەر یەکلاییکردنەوەیان بدات، لەسەر داوای لایەنی پەیوەندیدار، نەك پێشەکی شەرعییەت بە هەموو ئەو قانوونانە بدرێت، لەبەر ئەوەی حوکمی دەستوور لە حوکمی قانوون بالاّترە).**

★ ★ ★

# پەسندکردنی دەستوور بۆ هەرێمی کوردستان و
# بنەما سەرەکییەکانی ئەو دەستوورە

پەسندکردنی دەستوورێك بۆ هەرێمی کوردستان بەندە بە سیستمی سیاسی و شێوەی حوکمڕانکردن لە عێراق. لەوەتەی ئەم دەوڵەتە بەپێی دەستووری ساڵی 1925 دامەزراوە ناوەندایەتی (مەرکەزییەت) سیستمی حوکمڕانی بووە لە عێراقدا. رەشنووسی ئەو دەستوورەی ساڵی 1925 سەرەتا لە لایەن وەزارەتی کۆلۆنیالی بریتانیاوە ئامادە کرابوو. لە دەستووری کاتیی ساڵی 1958دا، دەسەڵات هەر بەدەست دەزگاکانی ناوەند مایەوە، ناوچە و ئوستانەکان (پارێزگاکان) دەسەڵاتێکی ئەوتۆیان نەبووە لە بەڕێوەبردنی کاروباری ناوخۆیی خۆیان. دەستووری کاتیی ساڵی 1970 کە پاش کۆدێتای ساڵی 1968 پەسندکراوە، دەسەڵاتی قانووندانان و ڕاپەڕاندن و دادوەری بە "ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش" دابوو، ئەم ئەنجومەنەش لە سەرکردەکانی حیزبی بەعسی دەسەڵاتدار پێکهاتبوو. لە ساڵی 1975دا قانوونی "حوکمی زاتی بۆ ناوچەی ئۆتۆنۆمی" دەرچوو، تێیدا بەناو بەشێك لە دەسەڵاتەکانی ناوەند بە دەزگاکانی "ناوچەی ئۆتۆنۆمی"درابوو، بەڵام بە کردەوە ئەو دەسەڵاتانە دەزگا ئەمنییەکانی رژێم لە ناوچەکە پراکتیزەیان دەکرد. ئەنجومەنی بەناو (ڕاپەڕاندن- تنفیذی) و ئەنجومەنی (بڕیاردان- تشریعی)، کە ئەندامەکانیان لە کەسانی سەر بە ڕژێم بوون، دەبوو پرس و ڕا بەو دەزگا ئەمنییانە بکەن، یان بگەڕێنەوە بۆ دەزگاکانی ناوەند بۆ هەموو کارێکی بچووك و گەورە. ئەو بەناو (ئەنجومەنی تەشریعی)یە مافی پەسندکردنی قانووندانانی نەبوو. بە کورتی (قانوونی حوکمی زاتی) بۆ ناوچەیەك دانرابوو کە دەبوو دەزگای تایبەتی خۆی هەبێت بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ناوچەکە، بەڵام بە کردەوە گۆڕانکاری لە شێوەی حوکمڕانکردنی ئەو ناوچەیە نەکرا.

ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی 1991 و کۆچڕەوە مەزنەکەی بووە هۆی دامەزراندنی (ناوچەییێکی ئارام) لە بەشێکی کوردستان. دامەزراندنی ئەو ناوچەیە لەژێر چاودێریی چەند دەوڵەتێکی ڕۆژئاوا بوو، چونکە فڕۆکە جەنگییەکانیان لە ئاسمانی ناوچەکە دەسووڕانەوە و ڕێگایان لە دەزگا سەرکوتکەرەکانی رژێم دەگرت درێژە بە کاری سەرکوتکەرانەیان بدەن. ڕژێم ناچاربوو بڕیاری کشانەوەی دەزگاکانی لەو ناوچەیە بدات، بەڵام هەوڵیشی دەدا باری سیاسی و ئابووری تێکبدات، بە ئابلۆقەدانی ناوچەکە

لـە ڕووی سیاسـی و ئابوورییـەوە. سـەرکردایەتی سیاسـیی بـەرەی کوردسـتانی، کـە لـەو دەمەدا بەرپرس بوو لە بەڕێوەبردنی کاروباری ناوچەکە، بڕیاری سازدانی هەڵبـژاردنی دا، تا خەڵکەکەی پەرلەمانێك دەستنیـشان بکـەن، ئـەویش حکومـەتێك دیـاری بکـات بـۆ بـەڕێوەبردنی کاروبـاری ناوچـەکە. پەرلـەمان و حکومـەتی هـەرێم وەك دوو دەزگـای دەوڵـەتی کاروبـاری نـاوخۆیی و پەیوەنـدیکردن بـە دەرەوەی وڵات و داکـۆکیکردن لـە سنووری ئەو بەشە ئازادکراوەی کوردستانیان دەکرد. پەسندکردنی سیستمی فیدراڵی لـە مـانگی تـشرینی یەکـەمی 1992دا لـە لایـەن پەرلـەمانی هەرێمـەوە بـووە هـۆی دامەزرانـدنی قـەوارەیێکی سیاسـی (دێ فاکتۆ) لـەو ناوچـەیە. ئـەم بڕیـارەی پەرلـەمان دەبـوو بڕیـارێکی تـری بـەدوادا بێـت، کـە پەسـندکردنی دەسـتوورێك بـوو بـۆ هـەرێمی کوردستان و تێیـدا دەسـەڵاتی دەزگـا سـەرەکییەکان دیـاری بکـرێن و ڕێکبخـرێن، لەگـەڵ ماف و ئەرکەکانی هاووڵاتییان.

مانەوەی ئەو دەزگایانە بەبێ دەستوور بووە هۆی دەستێوەردانی پارتـە سیاسـییەکان لە کاروباری ئەو دەزگایانە، بەتایبەتی پێشتر ڕاهاتبوون دەست بخەنە ناو کـاری بـچووك و گەورەی ئەو دەزگایانەوە. نەبوونی دەستوورێك کە تێیـدا دەسـەڵاتی دەزگاکـان دیـاری بکـرێن بـووە هـۆی بـەردەوامبوونی دەسـتێوەردانی حیـزب و دەزگاکـانی لـە کاروبـاری حکومەتی، چونکە سنووری دەسەڵاتەکانیان بـە ڕوونـی دیـاری نـەکرابوون. بـۆ نموونـە، پەرلـەمانی هـەرێم کـە ئـەرکی سـەرەکی قانوونـدانان و چـاودێریکردنی کارەکـانی حکومەتە، دەستی دەخستە ناو کاروباری حکومەتەوە، ئەوەش نـاکۆکی لێ پەیـدا دەبـوو. حیزبـە دەسـەڵاتدارەکان ئـەوانیش دەسـتیان دەخـستە نـاو کاروبـاری ئـەو دەزگایانـەوە، جاروبار لەجیاتی پەرلـەمان بڕیاریـان دەدا. دواتـر بـۆ شـەرعییەتدان بـە بڕیارەکانیـان، کارەکـەیان دەخـستە بـەردەم پەرلـەمان و داوایـان لێ دەکـرد پەسـندی بکـات! ئـەو دەستێوەردانە لە کاروباری پەرلەماندا هەتا پاش هەڵبـژاردنی خـولی دووەمـی پەرلـەمان بەردەوام بوو. بۆ نموونە، ڕێگا بە کۆبوونەوەی خولی دووەمی پەرلەمان بۆ ماوەی زیاتر لە 110 ڕۆژ نەدرا، کە کارێکی زۆر نا قانوونی بوو، بە پێچەوانەی قانوونی پەرلـەمانی کوردستان و پێڕەوی ناوخۆی ئەو پەرلەمانە بوو.

دەست خستنە ناو کاروباری پەرلەمان و حکومـەت بـێ بـاوەڕییێکی زۆری لای خـەڵك بەرانبـەر ئـەو دوو دامـەزراوە سـەرەکییەی کوردسـتان دروسـتکرد. یـەکێك لـە ئاکامـە

خراپـەکانی ئـەو دەسـتێوەردانەی حیزبـە دەسـەڵاتدارەکان لـە کاروبـاری پەرلـەمان و حکومەتدا، بەشداری نەکردنی خەڵك بوو لە دەنگدان و هەڵبژاردنەکانی دواتر، ئـەوەش ڕەنگدانـەوەیەکی خراپی لەسەر پاشەڕۆژی کوردستان هەبوو. ئەگەر دەستوور هـەبوایا و کاریـشی پـێ بکرابـا، چارەسـەری ئـەو کێـشانە دەکـرا. دانـانی دەسـتوور لـە کـاتی خۆیـدا دەبـووە هـۆی ڕێگـەگرتن لـە ڕوودانـی بەشـێك لـەو کارەسـاتانەی لـە سـاڵی 1994دا لـە کوردستان ڕوویان دا. جگە لـەوەش، پەسـندکردنی دەسـتوور دەبـووە هـۆی دامەزرانـدنی قەوارەیەکی سیاسیی پتەو، کە دەوڵەتانی ناوچەکە و نەیارانی کورد لە عێراقدا نەتوانن دەست بخەنە ناو کاروباری وڵاتەکەمانەوە.

لەپاش پەسندکردنی سیستمی فیدراڵی، کۆمەڵێك لـە قانوونناسـانی کوردسـتان داوای دانانی دەستووریان دەکرد، هەتا ئەگـەر لـە شـێوەی دەسـتوورێکی کـاتیش بێـت، چـونکە دەستوور سەرچاوەی دەسەڵات و قانوونەکانە و لەوێدا شێوەی حـوکمڕانی و ڕێکخـستنی دەسـەڵاتەکان دیـاری دەکرێـت، بەتایبـەتی پەیوەنـدیی نێـوان پەرلـەمان و حکومـەت و دەسەڵاتی دادوەری و دیاریکردنی مافەکانی هاووڵاتییان.

لــە حــوزەیرانی 1992دا، پــێش پەســندکردنی سیــستمی فیــدراڵی لــە لایــەن پەرلەمانــەوە، پـڕۆژەی دەسـتوورێکم ئامـادە کـرد، چـونکە دروشمـی فیـدراڵی لـە کـاتی هەڵبژاردندا دروشمی سـەرەکی بەشـی هـەرە زۆری هێـزە سیاسـییەکانی کوردسـتان بـوو. چاپکردنی ئەو پرۆژەیە ئاسان نەبوو، بۆیە سەرەتا بە دەستخەتی کاك محەمەد سەلیمی خۆشنووس نووسرایەوە، پاشـتر بـە هاوکـاریی خوالێخۆشـبوو دکتـۆر فازیـل قـەفتان، کـە بەڕێوەبەری دەزگای چاپی زانکۆی سەڵاحەددین بوو، بە ئۆفسێت (500) دانەی لێ چاپ کرا. پرۆژەکە بە چاپکراوی لەلایـەن دکتـۆر فازیـل قـەفتان، کـە ئەنـدامی پەرلـەمانیش بوو، بەسـەر هـەموو پەرلەمانتارانـدا دابـەش کـرا، لەگـەڵ لێکۆڵینـەوەیـەکی تایبـەت بـە فیدرالیزم بە زمـانی عـەرەبی، کـە پێـشتر بڵاوکرابـووەوە[1]. پرۆژەکـە بەسـەر لایەنـە

---

(1) ئەم توێژینەوە قانوونییە بە زمانی عەرەبی لەژێر ناوونیشانی: ( حول مفهوم النظام الفدرالي)، لە کۆتایی ساڵی 1974دا لە لەندەن ئامادەم کردبوو، دواتر لە ژمارە (16) و (17)ی گۆڤاری (کۆڕی زانیاری کورد)، لە ساڵی 1987دا بڵاوکرایەوە. لە ساڵی 1992دا جارێکی تر لەلایەن چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین لە هەولێر چاپ کرایەوە. کتێبخانەی (سۆران) لە هەولێر لە ساڵی 2005دا بۆ جاری سێیەم چاپی کردەوە، وەزارەتی ڕۆشنبیری لە ساڵی 2005 وەریگێڕایە سەر زمانی کوردی و بڵاوی کردەوە.

سیاسییەکانی کوردستان و میدیا و کۆمەڵێك لە قانووناساندا دابەش کرا، داواشیان لێ کرابوو ڕا و بۆچوونیان دەربارەی پرۆژەکە دەربڕن. سەرنجی کۆمەڵێك لە قانووناسان پرۆژەکەی دەوڵەمەندتر کرد. پاش دەستکاریکردنی بەپێی ئەو ڕا و سەرنجانە، پرۆژەکەم خستە بەردەست "دەستەی قانوونیی باڵا"، کە دەزگایەکی قانوونیی فەرمی بوو، بە بڕیاری پەرلەمان لە مانگی تەمووزی 1992دا لە (3) قانووناس پێکهاتبوو، ئەو دەستە قانوونییە لە پرۆژەکەی کۆڵییەوە و هەندێ دەستکاری تێدا کرد، پاشان پەسندی کرد و بە نووسراوێکی فەرمی پرۆژەکەی بۆ سەرۆکی حکومەت و سەرۆکی پەرلەمان و سەرۆکی هەردوو پارتی سەرەکی نارد. چاوەڕوان دەکرا لیژنەی قانوونی پەرلەمان لەو پرۆژەیە بکۆڵێتەوە، چونکە (33) پەرلەمانتار لە هەردوو فراکسیۆنە سەرەکییەکەی ناو خولی یەکەمی پەرلەمان، داوایان کردبوو پەرلەمان لێی بکۆڵێتەوە و پاشان پەسندی بکات، بەڵام داواکەیان تەماشا نەکرا. پرۆژەکە بۆ ماوەی زیاتر لە (10) ساڵ بەبێ خاوەن مایەوە!

لەو پرۆژەدا ڕاشکاوانە باس لە بنەمای جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان کراوە، کە دەسەڵاتێك نابێ دەست بخاتە ناو کاروباری دەسەڵاتێکی دیکەوە. هۆی پەسند نەکردنی ئەو پرۆژەیە دەگەڕێتەوە بۆ باری سیاسی لە عێراق و ناوچەکە لەو کاتەدا. لەلایەکەوە هێزەکانی ڕژێم ئابلۆقەی سەربازی و ئابووریيان خستبووە سەر ناوچەکە و هەڕەشەی داگیرکردنەوەیان دەکرد. هەڵوێستی ئەمریکا و بەریتانیا، کە فڕۆکە جەنگییەکانیان پاسەوانییان لە ئاسمانی ناوچەکە دەکرد، ڕوون نەبوو. ئەو دەوڵەتانە پشتگیرییان لە دامەزراندنی قەوارەیەکی سیاسی لە کوردستان نەدەکرد. وەزیرانی دەرەوەی دەوڵەتانی ناوچەکە بە بەردەوامی کۆدەبوونەوە و هەوڵی خنکاندنی ئەو کۆرپە ساوایەیان دەدا.

---

(2) لە پرۆژەی دەستووری ساڵی 1992دا باس لە هەڵبژاردنی (سەرۆکی هەرێم) کرابوو، بە پێچەوانەی ئەو قانوونە کە (سەرۆکایەتی سیاسیی بەرەی کوردستانی) بۆ هەڵبژاردنی (ڕابەری ڕزگاریخوازی بزووتنەوەی کورد) پەسندی کردبوو، پاشان پەرلەمانی هەرێمی کوردستان لە خولی یەکەمی بە ژمارە (2)ی ساڵی 1992دا پەسندی کردبوو لەژێر ئەو ناوەدا. پەرلەمانی هەرێم دواتر ئەو قانوونەی هەڵوەشاندەوە. بۆ زانیاریی زیاتر، تەماشای ئەو نووسینەم بکە کە لەژێر ناونیشانی: (پۆستی سەرۆکی هەرێمی کوردستان لەجیاتی پۆستی ڕابەری ڕزگاریخوازیی بزووتنەوەی کورد)، کە لە (هاوڵاتی)، ژمارە (221)، لە 2005/4/27 بلاوکراوەتەوە.

ئەم هۆیانە و چەند هۆیەکی دیکەی تایبەت بە پەیوەندیی نێوان هێزە سیاسییەکانی کوردستان و نەبوونی بەرنامەیەکی یەکگرتوو بۆ هاوکاری و هەماهەنگی لە نێوانیاندا، بوونە هۆی سەرنەکەوتنی ئەو پرۆسەیە. بەڵام ژمارەیەکی زۆر لە ڕووناکبیران لە ناوەوە و لە دەرەوەی کوردستان بە بەردەوامی داوای پەلەکردنیان لە دانانی دەستوور دەکرد، بێ ئەوەی سەرکەوتن بەدەست بهێنن.

ڕووخانی رژێمی بەعسی لە نیسانی 2003 و پەسندکردنی قانوونی بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عێراق بۆ ماوەی گواستنەوە، کە وەکو دەستوورێکی کاتی تەماشا دەکرا، وەرچەرخانێکی گەورە بوو لە مێژووی کوردستان و عێراق و ناوچەکەدا. سەبارەت بە کوردستان، بەندی (53)ی ئەو قانوونە دانی نابوو بە هەرێمی کوردستان، لە سنووری ئیداری ئەو ناوچانەی لە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی هەرێمدا بوون لە ئاداری 2003دا. بەندی (54)ی هەمان قانوون دانی بە دەزگا سەرەکییەکانی هەرێمدا نابوو، وەکو حکومەت و پەرلەمان و دەسەڵاتی دادوەری. پەرلەمانی کوردستان وەکو دەسەڵاتێکی قانووندانەر دەیتوانی درێژە بە کارەکانی بدات، تا ئەو دەمەی دەستوورێکی هەمیشەیی بۆ عێراق پەسند دەکرێت. پەرلەمان بەپێی ئەو قانوونە دەیتوانی قانوونی تازە لە هەرێمی کوردستان پەسند بکات، یان دەستکاری قانوونەکانی پێشتریش بکات، بە مەرجێك لەگەڵ بەندی (25) و پەرەگرافی (د) لە بەندی (43)ی ئەو قانوونە بگونجێن. لەو دوو بەندەدا چەند دەسەڵاتێکی "سیادی" دیاری کرابوون تایبەت بوون بە حکومەتی ناوەند، پەرلەمانی هەرێم دەبوو رێزیان لێ بگرێ لە کاتی پەسندکردنی قانوونی تازەدا. بە واتایەکی دی، پەرلەمانی کوردستان دەیتوانی هەموو جۆرە قانوونێك پەسند بکات، بە دەستووریشەوە، چونکە دەستووریش قانوونە بەڵام قانوونێکی باڵایە، بە مەرجێك ڕەچاوی ئەو دوو بەندە بکات.

خەڵکی کوردستان داوای دامەزراندنەوەی دەوڵەتی عێراقیان دەکرد لەسەر بنەمایەکی نوێ، چاکترین بنەماش بۆ دامەزراندنەوەی ئەو دەوڵەتە رێککەوتنی ئارەزوومەندانە بوو لە نێو پێکهاتە سەرەکییەکانی عێراقدا. ڕێککەوتن لە نێو دوو لایەن، یان زیاتر لە دووان، بە پێشنیازی لایەنێك و پەسندکردنی لایەنی دووەم پێکدێت. داخوازییەکانی گەلی کوردستان ئەگەر لە بەڵگەنامەیەکی قانوونی لە لایەن دەزگایەکی شەرعیی هەڵبژێرراوەوە ئامادە بکرابان، کە پەرلەمانی کوردستان بوو،

دەبووە پێشنیاز و چاوەڕێی قبـووڵی لایـەنی دووەمـی دەکـرد. خـولی دووەمـی پەرلـەمان شەرعییەتی بەدەستهێنابوو لەسەر ئاستی ناوەوە و دەرەوەدا، چونکە بەپێی قـانوونێکی عێراقی و لە لایەن دەزگایەکی عێراقییەوە (کۆمسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردن لە عێـراق) هەڵبـژێررابوو. دەوڵـەتی عێـراق و دەوڵـەتان و دەزگـا نێودەوڵەتییـەکان وەکـو نوێنەری شەرعیی گەلی کوردستان تەماشای پەرلەمانی هەرێمی دەکرد.

قـانوونی بـەڕێوەبردنی دەوڵـەتی عێـراق بـۆ مـاوەی گواسـتنەوە دانـی بـە هـەرێمی کوردسـتان و دەزگاکـانی نـابوو، بۆیـە دەیـانتوانی بـەردەوام بـن لـە جێبـەجێکردنی ئەرکـەکانی سەرشـانیان تـا ئـەو دەمـەی دەسـتوورێکی هەمیـشەیی بـۆ عێـراق پەسـند دەکرێ. هەرچەندە بەپێی ئەو قانوونە دەبوو پرۆژەی دەستووری عێراق بۆ ناوەڕاسـتی مـانگی ئـابی (2005) ئامـادە بکرێـت، بـەلاَم کـورد وتـەنی" تاریکـە شـەو لـە ئێـوارەوە دیارە"! جیـاوازی لـە نێـوان ئـەو لایەنانـەی بەشـدارییان لـە ئامـادەکردنی پـرۆژەی ئـەو دەستوورە دەکرد زۆر بوو، چاوەڕوان نەدەکرا پرۆسەکە لەو ماوە کورتەدا تەواو بکرێت. جگـە لـەوەش، بڕگـەی (ج) لـە بەنـدی (61)ی ئـەو قانوونـە زۆر گـرنگ بـوو بـۆ کـورد، چـونکە مـافی بـەکارهێنانی ڤیتـۆی بـە دانیـشتووانی دوو لەسـەر سـێی، (3) ئوسـتان (پارێزگا)ی دراوسێ دابـوو، کـە بتـوانن پـرۆژەی دەسـتوورەکە ڕەت بکەنـەوە، ئەگـەر بـە دڵیان نەبوو. زۆرینەی خەڵکی کوردستان تـا ئێـستا دوو جـار دەنگیـان بـۆ سـەربەخۆیی کوردسـتان داوە، بۆیـە لـەو بـاوەڕەدام دەنـگ بـۆ ئـەو دەسـتوورە نـادەن ئەگـەر هـەموو مافـەکانی گـەلی کوردسـتانی تێـدا مـسۆگەر نـەکرابێ. هـەروەها لـە هـەرێمی کوردسـتان دەزگای شەرعیی خاوەن دەسەڵات هەبوو، کە پەرلەمانی کوردستانە، ئەو خەڵکانەی ئەو دەزگایـــەیان هەڵبـــژاردبوو قبووڵیـــان نـــەدەکرد دەســـتووری ئاینـــدەی عێـــراق داواکارییەکانیانی تێدا نەبێ. پەرلەمانی هەرێم نوێنەری شەرعیی خەڵکی کوردستانە و دەتوانێ و دەبێ داواکارییەکانی ئەو خەڵکە لە دەستوورێکی تایبەت بە هەرێم دابڕێژێ. ئەم داواکارییانە دەخرێنە بەردەم لایەنی بەرانبـەر، کـە نوێنەرایـەتیی بەشـی عـەرەبی عێـراق دەکـات، ئەگـەر قبـووڵی بکـات، هـەرێمی کوردسـتان لـە چوارچـێوەی دەوڵـەتی فیـدراڵیی عێراقـدا دەمێنێتـەوە، بـەلاَم ئەگـەر قبـووڵی نـەکات، جـارێکی تـر حکومـەتی ناوەنـد نـاتوانێ هێـزە چـەکدارەکانی شـار و دێهاتـەکانی کوردسـتان داگـیر بکاتـەوە و لەشکرکێشی بکاتە سەر کوردستان.

لەم "شەڕە" دەستوورییەدا، پەرلەمانی کوردستان نـابێ وەك تەماشاکەر بێـت،  یـان چاوی لە بەغدا بێ و چاوەڕوان بێت چیمان پێ دەبەخشێ، یان چـی قبـووڵ دەکـات. بـە پێچەوانەوە، پێویستە داواکارییەکانی گەلی کوردستان ئامادە بکرێن لەناو  دەسـتوورێکی تایبـەت بـە هـەرێمی کوردسـتان و بخرێنـە بەرچـاو "ئەنجومـەنی نیـشتمانی عێراقـی". فراکسیۆنی کوردسـتانی لـەناو ئـەو ئەنجومەنـە دەتـوانێ داوای چەسـپاندنی نـاوەڕۆکی دەسـتووری هـەرێم بکـات لـەناو پـرۆژەی دەسـتووری عێـراق. دەسـتووری پەسـندکراوی هەرێمی کوردستان لە لایەن پەرلەمانی کوردستانەوە دەبووە داواکاریی گەلی کوردسـتان، لـەم ڕێگایـەوە داواکارییـەکانی گـەلی کوردسـتان لـەناو دەسـتووری هەمیـشەیی عێـراق دەچەسپێنران.

بۆچوونێکی تر هەیە پێی وایە پەسـندکردنی دەسـتووری هـەرێمی کوردسـتان دەبـێ دوابخرێـت بـۆ پـاش پەسـندکردنی دەسـتووری هەمیـشەیی عێـراق، چـونکە نـاوەرۆکی دەسـتووری هـەرێم دەبـێ گونجـاو بێـت لەگـەڵ دەسـتووری هەمیـشەیی عێراقـدا. ئـەم بۆچـوونە پەیوەنـدی بـە بـاری سیاسـی لـە عێـراق و ناوچـەکەوە هەیـە، چـونکە پەسندکردنی دەستوور بۆ  هەرێم دەبێتە هۆی گومان پەیـداکردن لـە لایـەن دەوڵـەتانی ناوچەکە و لایەنە سیاسییەکانی عێراقی، بەوەی "تۆمەتی" "جوداخوازی" بخرێتە پـاڵ کورد! بە بۆچوونی ئەوان چاکترە پەلە نەکرێت و چاوەڕێی دەسـتووری عێـراق بکرێـت، تا بزانین لەوێ چ سیستمێك قبووڵ دەکرێت و لەو سیـستمەدا چیمان پـێ دەدرێـت! بـە کـورتی، دەبـێ چـاومان لـە بەغـدا بـێ، تـا بـزانین لـە دەسـتووری هەمیـشەیی عێراقـدا مافەکانی گەلی کوردستان بە چ شێوەیەك دەچەسپێنرێن.

لایەنی کوردی لە کۆبوونەوەکانی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی لەو کۆنفرانسەی لـە لەنـدەن لە مانگی دیسەمبەری ساڵی 2002 بەسترابوو، هـەروەها لـە (ئەنجومـەنی حـوکمڕانیی عێـراق) مەسـەلەی مـافی چارەنووسـی گـەلی کوردسـتانی بـەلاوە نـابوو. چـونکە لەوێـدا بڕیاردرابوو دەستووری داهاتووی عێراق گـەلی عێـراق پێکـەوە پەسـندی بکـەن، ئـەوەش ناگونجێ لەگەڵ مافی گەلی کوردستان بۆ دیاریکردنی ئایندەی خۆی بە ئـارەزووی خـۆی. پەسـندکردنی پـرۆژەی دەسـتووری عێـراق لـە لایـەن تێکـڕای گـەلانی عێراقـەوە، وەکـو بڕیاری لەسەردراوە لە قانوونی بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عێراق لە ماوەی گواستنەوەدا، بە پێـچەوانەی بنـەمای ڕێککـەوتنی ئارەزوومەندانەیـە، لایـەنی کوردسـتانی و بەشـێك لـە

هێزە سیاسییەکانی عێراقی دەڵێن دەوڵەتی عێـراق دەبـێ لەسـەر ئـەم بنەمایـە دروسـت بکرێتەوە.

پەرلەمانی هەرێمی کوردستان بە هەموو پێوانەیەك نوێنەری راستەقینەی خـەڵکی کوردسـتانە. یـەکێك لـەو بابەتانـەی کـە پێویـستە پەرلـەمانی نـوێی کوردسـتان بڕیـاری لەسـەر بـدات، مەسـەلەی پەسـندکردنی دەسـتووره بـۆ هـەرێمی کوردسـتان بـێ چاوەڕێکردنی دەسـتووری عێـراق. ئـەم دەزگـا شـەرعییە دەبـێ لـە ئێـستاوە خـەریکی پێداچـوونەوە بێـت بـەو پـرۆژە دەسـتوورەی، کـە لـە مـانگی دیـسەمبەری 2003 بـە ئاگاداری و ڕەزامەنـدیی سـەرۆکی حکومـەتی هـەرێم و سـەرۆکی پەرلـەمانی کوردسـتان ئامادە کراوە. ئەو پـرۆژە دەسـتوورەی هـەرێم کـە چاککراوەو لەبەردەسـتایە، چاوەڕێی بڕیاری پەرلەمانی هەرێم دەکات، تـا گفتوگـۆی لەسـەر بکرێـت و بـە دواشـێوەی پەسـند بکرێـت.

کورد دەتوانێ ئـەو دەسـتوورەی هـەرێم بکاتـە بنـەما بـۆ داواکارییـەکانی لـە بەغـدا. فراکـسیۆنی کوردسـتانی لـە نـاو ئەنجومـەنی نیـشتمانی عێراقـی و پەرلـەمانی هـەرێم پێکەوە دەتوانن داکۆکی لێ بکەن و هەوڵی چەسپاندنی ناوەرۆکەکـەی لـەناو دەسـتووری هەمیشەیی عێراق بدەن.

لێـرەدا ئامـاژە بـۆ چـەند بنەمایـەکی ئـەو پرۆژەیـە دەکـەم، کـە تێیـدا بەشـێك لـە مافەکانی گـەلی کوردسـتانی تێـدا دیـاری کـراوە، چەسـپاندنی مـافی گـەلی کوردسـتان بـۆ دیاریکردنی چارەنووسی بە ئارەزووی خۆی لە بەندی سێی ئەو پرۆژەیەدا دیاری کراوە، بەوەی: "گەلی کوردستانی عێراق سەرچاوەی هەموو دەسەڵاتەکانە و هەر خـۆی بڕیـاری دواڕۆژی خۆی دەدا". لە بەندی یەکەمی هەمان ئەو پڕۆژەدا بـاس لـە دامەزراندنـەوەی دەوڵـەتی عێـراق لەسـەر بنـەمای ڕێککـەوتنی ئارەزوومەندانـە کـراوە، کـە "هـەرێمی کوردستانی عێراق هەرێمێکە لە هەرێمەکانی کۆماری عێراقی فیدراڵ و لەسـەر بنـەمای یەکگرتنی ئارەزوومەندانـە دروسـت بـووە". پرۆژەکـەی سـاڵی 1992 ڕاشـکاوانەتر ئـەم ڕاستییەی چەسپاندبوو، لە بەندی چواری ئـەو پـرۆژەدا هـاتووە: " گـەلی کوردسـتان بـە ویـست و ئـارەزووی خـۆی لەگـەڵ بەشـە عەرەبییەکـەی عێـراق، کۆمـارێکی فیـدراڵی پێکـدێنن"، ئـەوەش ئـەو ڕاسـتییە دەسـەلمێنی کـە دەوڵـەتی عێـراق لەسـەر بنـەمای ڕێککەوتنی ئارەزوومەندانە دروست دەکرێتەوە.

ئەمەبوو بە کورتی چەند بنەمایەکی دەستووری کە لە پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان چەسپێنراون، ئومێدەوارین لەم نزیکانەدا رەشنووسەکەی بخرێتە بەرچاو خەڵکی کوردستان، تا هاووڵاتییان بەشداری لە دەوڵەمەندکردنی بکەن، پێش ئەوەی پەسند بکرێت [*].

---

[*] ئەم نووسینە لە ناوەڕاستی ساڵی 2005 لە بەشێك لە رۆژنامەکانی کوردستان بڵاوکراوەتەوە.

# ڕێككەوتنی ئارەزوومەندانە وەك بنەما بۆ دامەزراندنەوەی دەوڵەتی عێراق[1]

گەلی كوردستان بەرەوڕووی خەباتێكی سیاسی و دەستووری سەخت بووەتەوە بۆ چەسپاندنی مافە ڕەواكانی لە دەستووری ئایندەی عێراقدا. لەو دەستوورەدا سیستمی حوكمڕانی لە عێراق و پەیوەندیی هەرێمی كوردستان بە حكومەتی ناوەندەوە دیاری دەكرێت، لەگەڵ مافە سەرەكییەكانی هاووڵاتییان و دابینكردنیان بە شێوەیەكی یەكسان بۆ هەمووان.

بەشێكی كەم لە لایەنە سیاسییەكانی عێراقی پشتگیری لە هێزە سیاسییەكانی كوردستان دەكرد و داوای دامەزراندنەوەی دەوڵەتی عێراقیان لەسەر بنەمای (تەوافوق) دەكرد. ئەم وشەیە لە "اتفاق"ەوە هاتووە، كە ڕێككەوتنی ئارەزوومەندانەیە، بە ڕەزامەندیی هەموو لایەنەكان پێكدێت. ڕێككەوتن سەرچاوەیەكی سەرەكییە بۆ ڕێكخستنی پەیوەندییەكان لە بواری مەدەنیدا، بەلام لە پەیوەندیی سیاسی و نێودەوڵەتیشدا سەرچاوەیەكی گرینگە بۆ ڕێكخستنیان. ڕێككەوتن زۆر جاران لەسەر پێشنیازی لایەنێك و پەسندكردنی لایەنی دووەم پێكدێت، دەستبەجێ، یان پاش وتووێژ و گفتوگۆ، ئەگەری ئەوەش هەیە لایەنەكان نەگەنە ڕێككەوتن و سەر نەگرێت.

گەر تەماشای مێژووی سیاسیی دەوڵەتان بكەین، دەبینین چەندەها دەوڵەت لە ئاكامی یەكگرتنەوەی چەند میرنشینێك یان ویلایەت یان ناوچەیەك دروستبوون. عێراق وەكو دەوڵەت لە پاش جەنگی یەكەمی جیهانی لە لایەن بەریتانیاوە دروستكراوە بۆ دابینكردنی بەرژەوەندییە ستراتیجی و ئابوورییەكانی لە ناوچەكەدا. ئەم دەوڵەتە بە دوو قۆناغ دامەزراوە، سەرەتا هەردوو ویلایەتی بەغدا و بەسرە یەكخراون و (مەملەكەتی عێراق)یان لێ دروستكراوە لە ژێر چاودێری بەریتانیا، كە لەشكرەكەی ئەو دوو ویلایەتەی داگیر كردبوو. لە قۆناغی دووەمدا، كە لە كۆتایی ساڵی 1925دا دەست پێ دەكات، ویلایەتی موسڵ خرایە سەر ئەو دەوڵەتە، پاش سازدانی ڕاپرسییەكی ڕواڵەتی لەژێر چاودێری (كۆمەڵەی گەلان). لكاندنی ئەم بەشەی كوردستان كە ئێستا بە كوردستانی عێراق ناودەبرێ، بە دەوڵەتی عێراقەوە بەپێی خواست و ئارەزووی

---

(1) ئەم بابەتە لە 18ی نیسانی 2005 لە بەشێك لە ڕۆژنامەكانی كوردستان بلاوكراوەتەوە.

خەڵکەکەی نەبووە. لەو "راپرسییەدا" پرسیار لە دانیشتوانی ویلایەتەکە نەکرابوو چییان دەوێت، داوایان لێ کرابوو وەڵامی پرسیارێك بدەنەوە بریتی بوو لەوەی، ئایا دەیانەوێ ببن بە بەشێك لە عێراق، یان لە تورکیا؟ دواڕۆژی ناوچەکە پێشتر لە لایەن دەوڵەتە زلهێزەکانەوە، پێش دەستپێکردنی جەنگی یەکەم دەستنیشان کرابوو. بەشێك لەو دەوڵەتانە تا ئەمڕۆش بە هاوکاریی چەند دەوڵەتێکی ناوچەکە هەوڵ دەدەن گۆڕانکاری لە شێوەی دامەزراندنەوەی دەوڵەتی عێراق نەکرێت، تا بە وتەی خۆیان "ئەمن و ئاسایش لە ناوچەکەدا بە بەرقەراری بمێنێتەوە"!

ئەگەر گەلی کوردستان پێشتر بەشداری لە پێکهێنانی دەوڵەتی عێراق نەکردبێ، ئەمڕۆکە بەشداری لەو پرۆسەیە دەکات، تا ڕێگا نەدات گەمەیەکی سیاسیی دیکەی لەگەڵدا بکرێتەوە. دونیای ئەمڕۆ وەك دونیای دوێنێ نییە، دەوڵەتان و هێزە سیاسییە عێراقییەکان ناتوانن ئیرادەی خۆیان بەسەر خواست و ئارەزووی گەلی کوردستاندا بسەپێنن، بە مەرجێ تەبایی و یەکڕیزی لە نێو هێزە سیاسییەکانیدا هەبێ و بەهێزبێ و هەموو پێکەوە داواکارییەکانی گەلی کوردستان دیاری بکەن و جەخت لەسەر چەسپاندنیان لە ناو دەستووری هەرێمی کوردستان و دەستووری داهاتووی عێراقدا بکەن. ڕێککەوتنی ئارەزوومەندانە لە نێو هەردوو پێکهاتەی سەرەکیی عێراق، گەلی کوردستان و گەلی عەرەبی عێراق باشترین ئامرازە بۆ گەیشتن بەو ئامانجانە و چەسپاندنی بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا لە هەدوو دەستوورەکەدا.

یەکێك لە دەستکەوتە گرنگەکانی گەلی کوردستان لە پاش رووخانی رژێمی پاشایەتی لە ساڵی 1958، پەسندکردنی دەستوورێکی کاتی بوو، کە دانی بە هەردوو پێکهاتەی سەرەکیی گەلی عێراقدا نابوو، بەوەی لە دوو نەتەوەی عەرەب و کورد پێکهاتووە. بەڵام ئەو دەستوورە لە ڕووی شێوازی حوکمڕانیکردن لە عێراق گۆڕانکاری تێدا نەکرابوو. لە سەرەتای دامەزراندنی ئەو دەوڵەتەوە حوکمڕانی لەسەر بنەمای ناوەندییەتی (مەرکەزییەت) بووە، ئەوەش بووەتە هۆی ئەوە مەسەلەی کورد تا ئێستا بە چارەسەرنەکراوی بمێنێتەوە و گەلی کورد بە ناچاری بکەوێتە داکۆکیکردن لە مافە ڕەواکانی. شەڕی نێوان کورد و رژێمی حکومەتی قاسم ڕێگای خۆش کرد بۆ سەرکەوتنی کۆدێتای ساڵی 1963، کە پاش چەند ساڵێك کۆدێتای 1968ی بەدوادا هات. عێراق کەوتە ژێر حوکمی ڕژێمێکی تۆتالیتاری عەسکەری، پاشان تاکە حیزبی و تاکە کەسی، تا

**لەناوچوونی لـە نیـسانی 2003دا. داواکارییـەکانی بەشـی زۆری پێکهاتـەی نەتـەوەیی و مەزهـەبیی عێـراق، بـەوەی ئـەو دەوڵەتـە لەسـەر بنەمایـەکی نـوێ دابمەزرێتـەوە، بـۆ ڕێگاگرتنە لە گەڕانەوەی ئەو جۆرە رژێمانـە و چەسـپاندنی فیدراڵییـەت و سیـستمێکی دیموکراتی و فرە حیزبی لە عێراقدا.**

**گەلی کوردستان لە ساڵی 1992دا داوای دامەزراندنـەوەی دەوڵـەتی عێراقـی کـردووە لەسەر بنەمای ڕێککەوتنی ئارەزوومەندانە لە نێوان هەردوو نەتەوەی سەرەکیی عێراق: عەرەب و کورد. پەرلەمانی هەرێمی کوردستان داوای دروستکردنەوەی دەوڵەتی عێراقـی کردووە لەسەر بنەمای فیدراڵییەت، ئەوەش لە ڕێککەوتنێکی ئارەزوومەندانـەدا لـە نێـو هەردوو گەلی کوردستان و گەلی عەرەبی لە بەشی عەرەبی عێراقـدا. ئـەم داواکارییـە لـە بەندی چوارەمی پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان بە ڕوونی دیاری کراوە. کەواتە ئەم داواکارییەی گەلی کوردستان تازە نییە، لێرەدا دەبێ ئەو ڕاستییە بخرێتە بەرچاو، تا لە کاتی دانوستان و گفتوگۆ بۆ داڕشتنی بەندەکانی دەستووری هەمیشەیی عێـراق، ئـەو داواکارییەی کورد وەك "تۆمەتێکی نوێ و تەعجیزی" نەخرێتە پاڵی !**

**پەرلـەمانی هـەرێمی کوردسـتان لـە تـشرینی یەکـەمی 1992دا سیـستمی فیـدراڵی پەسند کردووە وەك سیـستمێکی دەسـتووری بـۆ پاشـەڕۆژی عێـراق. ئـەم "پێـشنیاز"ەی پەرلەمانی کوردستان، وەك هەموو پێشنیازێکی دیکە، چاوەڕێی وەڵامدانـەوە دەکـات بـە قبووڵکردنی، یان بە ڕەتکردنەوەی. ئەگـەر پەسـند بکرێـت لـە لایـەن نوێنـەرانی بەشـی عـەرەبی عێراقـەوە، ڕێککەوتنەکـە پێکـدێ، پاشـان لـە ڕێگـای وتووێـژ و دانوسـتانەوە وردەکارییـەکانی یـەکلایی دەکرێنـەوە. لایـەنی عـەرەبی دەتـوانێ ئـەم پێـشنیازە ڕەت بکاتەوە و قبووڵی نەکات، بـەڵام نـاتوانێ سیـستمێکی دەسـتووریی دیکـە بەسـەر لایـەنی کوردستانیدا بسەپێنێ.**

**قـانوونی کـاتیی دەوڵـەتی عێـراق بـۆ مـاوەی گواسـتنەوە سیـستمی فیـدراڵی قبـووڵ کردووە بۆ پاشەڕۆژی عێراق، بەڵام کۆمـەڵێك بابـەتی گـرینگ ماونەتـەوە پێویـستە بـە ڕوونی لە دەستووری ئایندەی عێراقـدا دیـاری بکـرێن. پەسـندکردنی سیـستمی فیـدراڵی بەپێی ئەو قانوونە وەڵامدانەوەیە بۆ پێشنیازی پەرلـەمانی هـەرێمی کوردسـتان، بـەڵام پرۆسـەی ڕێککـەوتنی ئارەزوومەندانـە لێـرەدا کۆتـایی نـەهاتووە، هەرچـەندە قۆنـاغی سەرەکییە. بە گوێرەی قانوونی ناوبراو، ڕەشنووسی ئەو دەستوورە کە بۆ عێراق ئامـادە**

دەكرێت، لە لایەن ئەنجومەنی نیشتمانیی عێراقییەوە بەپێی "تەوافوق" پەسند ناكرێت، بەڵكو هەموو گەلی عێراق پێكەوە دەنگی لەسەر دەدەن، ئەوەش لەگەڵ بنەمای رێككەوتنی ئارەزوومەندانە لە نێو هەردوو پێكهاتە سەرەكییەكەی عێراق ناگونجێ و بە پێچەوانەی مافی گەلی كوردستانە بۆ دیاریكردنی ئایندە و چارەنووسی بە ئارەزووی خۆی.

لە كۆنفرانسی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی، كە لە لەندەن لە مانگی كانوونی یەكەمی ساڵی 2002دا رێكخرابوو، هەروەها لە كۆبوونەوەی ساڵی پاشتر لە هاوینەهەواری سەلاحەددین، دواتر لە قانوونی كاتیی بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عێراق بڕیاری لەسەر دراوە، دەستووری ئایندەی عێراق لە لایەن تێكڕای گەلی عێراقەوە پەسند دەكرێت، ئەوەش بە پێچەوانەی پرەنسیپی رێككەوتنی ئارەزوومەندانە و مافی چارەنووسە بۆ گەلی كوردستان. لە پرۆژەی دەستووری هەرێمی كوردستان، كە لە ساڵی 1992دا ئامادەم كردووە، هەروەها لە كۆنفرانسێكی دەستووری كە لە مانگی ئەیلوولی 1994دا لە زانكۆی (پرنستن)ی ئەمریكی بۆ گفتوگۆ لەسەر سیستمی دەستووری بۆ عێراقی پاش ڕووخانی رژێمی بەعس بەسترابوو، لایەنی كوردی داوای ئامادەكردنی پرۆژەی دەستووری ئایندەی عێراقی كرد بەپێی رێككەوتنی ئارەزوومەندانە. قانوونی كاتیی بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عێراق، كە سەرچاوەكەی كۆنفرانسی لەندەنی مانگی دیسەمبەری 2002 بوو، مافی پەسندكردنی ڕەشنووسی دەستووری هەمیشەیی عێراقی بە ئەنجومەنی نیشتمانی عێراق داوە. لە هەنگاوی دووەمدا، دەنگدەران لە هەموو عێراق لە راپرسێكی گشتیدا دەنگ لەسەر ئەو پرۆژەیە دەدەن. لەم پرۆسەدا پێڕەو بە بنەمای رێككەوتنی ئارەزوومەندانە نەكراوە، چونكە بەجیا داوا لە گەلی كوردستان نەكراوە دەنگ لەسەر ئەو پرۆژە دەستوورە بدەن، كوردیش وەكو بەشێك لە گەلی عێراق دەنگ دەدەن.

بەشداریكردنی فراكسیۆنی كوردستانی وەكو بەشێك لە ئەنجومەنی نیشتمانی عێراقی لە ئامادەكردنی پرۆژەی ئەو دەستوورە ئەگەر بە "تەوافوق" بێ، بەپێی بنەمای رێككەوتنی ئارەزوومەندانەیە، بەڵام ئەگەر پەسندكردنی پرۆژەكە لە لایەن تێكڕای گەلی عێراقەوە بێت، ئەوا كار بەو بنەمایە نەكراوە. ئەگەر پرۆژەی ئەو

**دەستووره راستەوخۆ بە "تەوافوق" لە لایەن ئەنجومەنی نیشتمانی عێراقیـەوە پەسـند بکرێت، کارەکە گونجاوتر دەبێ لەگەڵ ئەو دوو بنەمایەی سەرەوە.**

**تازه دەستکاری قانوونی کاتیی بـەڕێوەبردنی دەوڵـەتی عێـراق ناکرێـت، بۆیـە دەبـێ هـەوڵی چارەسـەرکردنی مەسـەلەکە بـدرێت بـە شـێوەیەك لەگـەڵ ئـەو دوو بنەمایـە بگونجێ.**

**بڕگەی (ج) لە بەندی (61)ی قانوونی کاتیی بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عێراق ڕێگا بـە دوو لەسەر سێی دانیشتوانی (3) پارێزگای هاوسنوور دەدات، پرۆژەی دەسـتوورەکە ڕەت بکەنـەوە. ئـەم بڕگەیـە کـاتی خـۆی کێـشەی لەسـەر دروسـتکرا، گرووپـی شـیعە لـە نـاو ئەنجومەنی حوکمڕانی عێراق وایـان لێکدەدایـەوە ئـەو بڕگەیـە بـۆ بەرژەوەنـدیی کـورد داڕێـژراوە، چـونکە دەتـوانن وەکـو (ڤیتـۆ) بـەکاری بێـنن ئەگـەر مافـە ڕەواکـانی گـەلی کوردستان لە پرۆژەی دەستووری عێراق نەچەسپێن. بەڵام ئەم بەناو "ڤیتۆ"یە کورد و نەیارانی کوردیش لە (3) پارێزگای دیکـەی عێراقـدا دەتـوانن بـەکاری بێـنن. ئـەوانیش دەتوانن بە هۆی ئەو بڕگەوە، پرۆژەی دەستووری ئایندەی عێراق ڕەت بکەنەوە، ئەگـەر سیستمی فیدراڵی بەو شێوەی گەلی کوردستان داوای دەکات، پەسند بکرێت.**

**پێکەوە ژیانی کورد و عەرەب لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی یەکگرتووی عێراقدا بەندە بەوەی ئەو دوو نەتەوە سەرەکییەی عێراق بتوانن بەپێی ڕێککەوتنێکی ئارەزوومەندانە ئەم دەوڵەتە دابمەزرێننەوە. ئەم دەوڵەتە لەسەر خاکی دوو نەتەوەی جیاواز دامەزراوە، دامەزراندنـەوەی دەبـێ بـە ڕێککـەوتن لـە نێـو نوێنـەرانی ئـەو دوو نەتەوەیـە بـێ. پەرلەمانی هەرێمی کوردستان لە 30 کانوونی دووەمی 2005 هەڵبژێرراوە، حکومـەتی عێـراق و چـەند دەوڵـەتێك وەکـو نوێنـەری گـەلی کوردسـتان تەماشـای دەکـەن، چـونکە بـەپێی قـانوونێکی عێراقـی، کـە قـانوونی هەڵبـژاردنی ژمـارە (92)ی سـاڵی 2004 لـە لایەن ئەنجومەنی حوکمڕانی عێراقەوە پەسند کراوە، هەڵبژێرراوە. ئەو هەڵبژاردنە لـە ژێر چاودێریی دەزگایەکی عێراقی – نێودەوڵەتی ئەنجام دراوە، بۆیە پەرلەمانی هەرێم وەکو نوێنەری گەلی کوردستان دەتوانێ بەشـداری لـە دامەزراندنـەوەی دەوڵـەتی عێـراق بکات، بە ئامادەکردنی دەستوورێك بـۆ هـەرێم کـە تێیـدا مافـەکانی گـەلی کوردسـتان بـە ڕوونی دیاری بکرێن، بە مافی چارەنووسـەوە. ئـەو بەڵگەنامەیـە دەسـتوورییە دەبـێ لـە لایەن فراکسیۆنی کوردستانی لە ئەنجومەنی نیشتمانی عێراقی بخرێتـە بەرچـاو لایەنـە**

سیاسییەکانی عەرەبی وەکو داواکاری گەلی کوردستان، تا لەسەر بنەمای ڕێککەوتنی ئارەزوومەندانە گفتوگۆی لەسەربکرێت. گەر لایەنی بەرانبەر داخوازییەکانی لایەنی کوردستانی قبووڵ بکات، ئەوا ڕێك دەکەون، بەڵام ئەگەر ئەو داواکارییانە ڕەت بکاتەوە، ئەوا مافی ئەوەی نییە ئیرادەی خۆی بەسەر لایەنی کوردستانیدا بسەپێنێ، چونکە بە پێچەوانەی بنەمای ڕێککەوتنی ئارەزوومەندانە و مافی گەلی کوردستانە بە دیاریکردنی پاشەڕۆژی خۆی بەپێی خواست و ئارەزووی خۆی.

هەڵبژاردنی 30 کانوونی دووەمی 2005 ئەو لایەنانەی دیاری کردووە کە دەتوانن وەك نوێنەری عەرەبی عێراق وتووێژ لەگەڵ لایەنی کوردستانیدا بکەن، هەرچەندە بەشێك لە کۆمەڵگای عەرەبی، کە بە "عەرەبی سونە" ناودەبرێن، بەشدارییان لەو هەڵبژاردنە نەکردووە. ئەمڕۆکە هەموو لایەنەکان کۆکن لەسەر ئەوەی نوێنەرانی عەرەبی سونە دەبێ بەشداری لە ئامادەکردنی ڕەشنووسی دەستووری ئایندەی عێراق بکەن، تاکو پابەندبن بە ئاکامەکانییەوە.

پێشنیازی گەلی کوردستان بەقبوولکردنی فیدراڵی بۆ پاشەڕۆژی عێراق لە ساڵی 1992وە لە لایەن پەرلەمانی کوردستانەوە خراوەتە بەرچاو، بەڵام ناوەرۆکەکەی و سنووری هەرێمی کوردستان و شێوەی حوکمڕانیکردنی عێراق و کۆمەڵێك لە وردەکاریی دیکە باسیان لێ نەکراوە، پێویستە هەموویان یەکلایی بکرێنەوە لە پرۆژەی دەستووری هەمیشەیی عێراقدا. لایەنی کوردستانی کاتێ پابەند دەبێ بە دەستووری هەمیشەیی عێراق و پەیڕەو بەو دەستوورە دەکات، ئەگەر لە لایەن نوێنەرانیەوە پەسندکرابێ، کە پەرلەمانی هەرێمی کوردستان و گرووپی کوردستانییە لەناو ئەنجومەنی نیشتمانی عێراقی. خۆشبەختانە لایەنە سیاسییەکانی کوردستان یەك هەڵوێستیان هەیە و پێکەوە داواکارییەکانی خەڵکی کوردستان دەخەنە بەرچاو.

بەشداریکردنی پەرلەمانی کوردستان لەو "شەڕە" دەستوورییەدا پشتیوانییەکی بەهێزە بۆ فراکسیۆنی کوردستانی لەناو ئەنجومەنی نیشتمانی عێراقی. بەشداریکردنەکەی بە دیاریکردنی داواکارییەکانی گەلی کوردستان دەبێ لە دەستووری هەرێمی کوردستاندا. خەباتەکە سەختە و پێویست بە هاوکاری و بەشداریکردنی هەموو دەزگا شەرعییەکانی کوردستان دەکات، لە پێناو چەسپاندنی مافەکانی گەلەکەمان لە دەستووری ئایندەی عێراقدا. لەناو گرووپی عەرەبی شیعە و سونەدا،

لایــەنی سیاســیی وا هەیــە فیدراڵییــەت بــە "بیدعــە" دەزانــن، یــان بــە ســەرەتای "جیابوونەوە". بەلای ئەوانەوە عێراق لەوەتەی هەیە یەك پارچە بووە و دەبێ بەو جۆرەش بمێنێتەوە! ئەو لایەنانە گەر بە ناچاری دروشمی فیدراڵی قبووڵ بکەن، لەسەر ناوەرۆکەکەی هەزار کێشە دروست دەکەن. بۆ نموونە، نوێنەری "مەجلیسی ئیسلامیی ئەعلا"، کە بەناو لە حیزبی دەعوە کراوەترە، لە ئەنقەرە لە 24ی ئاداری 2005دا ڕایگەیاند کە فیدراڵییەت لەسەر بنەمای جوگرافیای ئیداری دەبێ و جیاوازی لە نێو هیچ بەشێکی عێراقدا نییە، لە کاتێکدا لە بەڵگەنامەیەکی قانوونی ئیمزاکراودا، کە لەلایەن ئەو گرووپەوە مۆرکراوە، فیدراڵییەت لەسەر بنەمای مێژوویی و جوگرافیا قبووڵ کراوە.

داواکارییەکانی گەلی کوردستان دەبێ لە بەڵگەنامەیەکی قانوونیدا ئامادە بکرێن، وەکو "پێشنیاز" بخرێنە بەرچاو لایەنی عەرەبی و هەوڵ بدرێت لەسەر مێزی گفتوگۆ ڕوون بکرێنەوە. فیدراڵییەت سیستمێکی دەستوورییە و میکانیزمی تایبەتیی خۆی هەیە. بەشێك لە لایەنە سیاسییەکانی عێراقی، بە بیانگەی ڕێگەگرتن لە "جیابوونەوەی کوردستان"، هەوڵی زیندووکردنەوەی پرۆژەکەی (پۆڵ برێمەر) دەدەن، کە بەناو "فیدراڵییەت" بوو، بەڵام ناوەرۆکەکەی (لامەرکەزیەتی) تێپەڕ نەدەکرد. هەرێمی کوردستان وەکو (ناوچەیەکی ئۆتۆنۆم) تەماشا دەکرێ، بەڵام لە ژێر ناوی "هەرێمی کوردستان"، بەشەکانی دیکەی عێراق وەکو خۆیان بمێننەوە و پەرلەمانێکی فیدراڵی بە دوو ئەنجومەن دروست نەکرێت.

پەرلەمانی کوردستان وەکو نوێنەری گەلی کوردستان دەسەڵاتی پەسندکردن و ڕەتکردنەوەی پرۆژەی دەستووری عێراقی هەیە، چ بە بەکارهێنانی مافی چارەنووسی گەلی کوردستان، یان بەپێی پەرەگرافی (ج)ی بەندی (61) لە قانوونی کاتیی دەوڵەتی عێراق. ئەگەر دامەزراندنەوەی دەوڵەتی عێراق لەسەر بنچینەی ڕێککەوتنی ئارەزوومەندانە بێ، دەبێ هەدوو لایەنی سەرەکی بکەونە گفتوگۆ و دانوستانەوە بۆ ڕێککەوتن لەسەر بنەما و وردەکارییەکانی ناو ئەو دەستوورە.

# چاو پێکەوتنێکی ڕۆژنامەوانی لەگەڵ د. نووری تاڵەبانی لەبارەی پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان[1]

**پ1/ هۆکاری پەلەکردن لە پەسندکردنی دەستوور بۆ هەرێمی کوردستان چییە، بۆچی لە ساڵی 1992ەوە هەوڵی دانانی دەستوورتان داوە؟**

و1/ پەرلەمانی هەرێمی کوردستان لەمانگی تشرینی یەکەمی ساڵی 1992دا سیستمی فیدراڵی بۆ ڕێکخستنی پێوەندیی نێوان هەرێمی کوردستان و حکومەتی عێراق پەسندکردووە. ئەو بڕیارەی پەرلەمان بووە هۆی دامەزراندنی قەوارەیەکی (دێ فاکتۆ) لەو ناوچەی بە "ناوچەی حوکمی زاتی" ناو دەبرا. دەسەڵاتی کوردی بەرپرس بوو لە بەڕێوەبردنی کاروباری ناوخۆیی، لەگەڵ پەیوەندیکردن بە دەرەوەی وڵات و داکۆکیکردن لە سنووری ئەو ناوچەیە. حکومەتی کوردی بە کردەوە دەسەڵاتەکانی دەوڵەتیی پیادە دەکرد. ئەم بڕیارەی پەرلەمان دەبوو بڕیارێکی دیکەی بەدوادابێت، بە پەسندکردنی دەستوور بۆ هەرێمی کوردستان، تێیدا دەسەڵاتەکانی دامەزراو و دەزگاکانی هەرێم دیاری بکرێن، لەگەڵ ماف و ئەرکەکانی هاووڵاتییاندا. لەو دەمەوە بە بەردەوامی داوای دانانی دەستوورمان بۆ هەرێمی کوردستان کردووە، هەتا ئەگەر لە شێوەی دەستوورێکی کاتیش بێت، چونکە دەستوور سەرچاوەی هەموو قانوونەکانە لەوێدا شێوەی حوکمڕانی و چۆنیەتی دابەشکردنی دەسەڵاتەکان و ڕێکخستنیان دیاری دەکرێت.

لە مانگی تەمووزی 1992دا، پێش پەسندکردنی سیستمی فیدراڵی لەلایەن پەرلەمانەوە، پرۆژەی دەستوورێکم بە زمانی عەرەبی بۆ هەرێمی کوردستان ئامادە کرد، چونکە لەپاش ڕاپەڕینەوە فیدراڵی بووە دروشمی بەشی هەرەزۆری لایەنە سیاسییەکانی کوردستان. ئەو پرۆژەیە لە چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین چاپکرا و دابەش کرا بەسەر ئەندامانی پەرلەمان و هەموو لایەنە سیاسییەکان و میدیا و کۆمەڵێك لە قانووناسانی کوردستان، تا ڕا و سەرنجی خۆیان دەربارەی دەربڕن. تێبینی

---

(1) فەرمان ڕەشاد ئەم دیمانەی ئامادە کردووە و لە بەشێك لە ڕۆژنامەکانی کوردستان بڵاو کراوەتەوە.

بەشێك لە قانووناسان بووە هۆی دەوڵەمەندکردنی پرۆژەکە، دواتر بە دواشێوەی خرایە بەردەم دەزگایەکی قانوونیی فەرمی، کە ئەندام بووم تێیدا بە ناوی (دەستەی قانوونیی باڵا). لەپاش پێداچوونەوەیەکی ورد، پرۆژەکە بە نووسراوێکی فەرمی لە لایەن ئەو دەستەوە نێردرا بۆ سەرۆکایەتی حکومەت و پەرلەمانی کوردستان، لەگەڵ هەردوو حیزبی سەرەکی، بە ئومێدی پەسندکردنی لە لایەن پەرلەمانەوە. باری سیاسی لەو دەمەدا ئاڵۆزبوو، هێزەکانی رژێم ئابلۆقەیێکی سەربازی و ئابوورییان لەسەر ناوچەکە دانابوو و هەڕەشەی داگیرکردنەوەیان دەکرد، ئەمریکا و بەریتانیا کە فڕۆکە جەنگییەکانیان لە تورکیاوە ئاگاداری ئاسمانی ناوچەکەیان دەکرد لە ترسی دەستدرێژیکردنی رژێم، پشتگیرییان لە دامەزراندنی کیانێکی سیاسیی کوردی نەدەکرد. وەزیرانی دەرەوەی تورکیا و ئێران و سوریا بە مەبەستی پلاندانان بۆ خنکاندنی ئەو کۆرپە ساوایە، کۆدەبوونەوە. ئەو هۆیە دەرەکییانە، لەگەڵ چەند هۆیەکی ناوەکی کە پەیوەندییان بە ناکۆکیی نێوان هەردوو حیزبی دەسەڵاتدارەوە هەبوو، بوونە هۆی دواخستنی پەسندکردنی ئەو پرۆژە دەستوورە، بەتایبەتی پاش دەستپێکردنی شەڕی ناوخۆ لە ساڵی 1994، کە تا 1998 درێژەی کێشا. بەڵام لەو ماوەدا کۆمەڵێکی زۆر لە ڕووناکبیرانی کوردستان لە دەرەوە و ناوەوە، داوای دانانی دەستووریان دەکرد، بەڵام دەسەڵات گوێی لێ نەدەگرتن. لە مانگی نۆڤەمبەری 2002دا پرۆژە دەستوورێکی تازە پەسند کرا، بەڵام وەك (پرۆژە) مایەوە، ماددە سەرەکییەکانی لە پرۆژەی ساڵی 1992 وەرگیرابوون، بەڵام دەستکاری لە بەشێکیان کرابوو. بۆ نموونە، لە پرۆژەکەی ساڵی 2002دا پێشنیازکرابوو سەرۆکی هەرێم بەو شێوە هەڵبژێردرێ کە سەرۆکی کۆماری عێراق لە دەستووری ئایندەی عێراقدا هەڵدەبژێردرێ، بەڵام لە پرۆژەی ساڵی 1992دا پێشنیازکراوە سەرۆکی هەرێم لە لایەن پەرلەمانی کوردستانەوە هەڵبژێردرێ. جیاوازییێکی دیکە لە نێوان ئەو دوو پرۆژە ئەوەبوو، لە پرۆژەی 2002دا شاری کەرکووك کرابووە پایتەختی هەرێمی کوردستان، بەڵام لە پرۆژەی ساڵی 1992دا هەولێر کرابووە پایتەخت. ئەگەر لە ساڵی 1992دا دەستوورێك لەلایەن پەرلەمانەوە پەسند بکرابا، باری سیاسی و قانوونی لە کوردستان بەرەو سەقامگیری دەچوو، بوونی دەستوور ڕەنگبێ ڕێگای لە هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ بگرتبا، چونکە دەستوور شێوازی

حـوکمڕانیی وڵاتـی دیـاری دەکـرد، ئـەوەش دەبـووە هـۆی کەمکردنـەوەی دەسـەڵاتی حیزبەکان و نەتوانن بە زەقی بنەماکانی ئەو دەستوورە پێشێل بکەن.

**پ2/ دەگوترێت بەشێکی زۆر لە ماددەکانی ئەو پرۆژە دەستوورەی لە تـەمموزی 2009 پەرلەمانی کوردستان پەسندی کرد بەپێی میزاجی چەند کەسێك داڕێژراون، ئەوەش هۆکاری سەرەکیی دەست لەکارکێشانەوەتان بوو لە لیژنەی دەستوور، ئێوە لەو بارەوە چی دەڵێن؟**

و2/ هۆکاری سەرەکی بۆ دەست لەکارکێشانەوەم لەو لیژنەیە لە سەرەتای مانگی تەمووزی 2008 هەوڵدانی سەرۆکی ئەو لیژنەیە بوو بە سەپاندنی ڕا و بۆچوونەکانی بەسەر لیژنەکەدا، ئەوەش بە من قبووڵ نەدەکرا. لێرەدا وەك نموونـە چـەند حاڵـەتێك دەخەمە بەرچاو. لە حوزەیرانی 2006دا لیژنەی دەسـتووری ئەرکـەکانی خـۆی تـەواو کرد، بە ئامـادەکردنی پـرۆژەی دەسـتوورەکە. هەرچـەند تێبینـیم لەسـەری هـەبوو، بـە نووسراویش ئاگاداری سەرۆکی لیژنەکەم کردبۆوە، بەڵام وتـی تـازە نـاتوانین دەسـتکاری لـە پرۆژەکـەدا بکـەین چـونکە دواشـێوەی وەرگرتـووە، داواشـی لێکـردم پرۆژەکـە لـە عەرەبییەوە وەریبگێڕمە سەر زمـانی کـوردی. لـەکاتی پـشووی هـاوینی پەرلـەمانی ئـەو ساڵە لە لەندەن خەریکی وەرگێڕانی پرۆژەکە بووم، لە کۆتایی مانگی ئابی 2006 ئـەو ئەرکە قورسـەم تـەواوکرد و بەچاپکراوی پرۆژەکـەم ڕادەسـتی سـەرۆکی لیژنـەکە کـرد، بەڵام داوای لێکردم چەند دەستکارییێکیان لە پرۆژەکەدا کردووە و ئـەو دەسـتکارییانەش وەربگێڕمە سەر زمـانی کـوردی. ئاگـاداری ئـەو دەسـتکارییانە نـەکرابووم، دەرکـەوت لـە کۆبوونـەوەیەکی بەناو "نائاساییدا"، کە هەفتەیـەك پـێش تـەواوبوونی پـشووی هـاوینی پەرلەمان ئەنجامـدرابوو، تێیـدا دەسـتکاری 22 مـاددە و بڕگـە کرابـوو! لـە یـەکێك لـەو دەستکارییە تازانەدا ماددەی 140یان کردبووە بنەما بـۆ دیـاریکردنی سـنووری سیاسـی هەرێمی کوردستان. ڕەخنەم لەو کارەی لیژنەکە گـرت، لەوەدەچـوو ڕەخنـەگر هـەر مـن بم! پـاش بڵاوکردنـەوەی پرۆژەکـە لـە ئـەیلوولی 2006دا نزیکـەی دوو سـاڵ لیژنـەکـە کۆنـەبووەوە بـۆ تەماشـاکردنی ئـەو هـەموو تێبینـی و پێـشنیازانەی بـۆ لیژنەکـە نێردرابـوون. بـەڵام لـە سـەرەتای دەسـتپێکردنی پـشووی هـاوینی 2008، سـەرۆکی لیژنەکـە کۆبوونـەوەی بـە لیژنەکـە کردبـوو، تێـدا دەسـتکاری چـەندین مـاددەی دیکـە کرابوو، بەڵام بەشداریم لـەو کۆبوونەوانـە نـەکرد، چـونکە دەمزانـی هـەمان سـیناریۆی

مانگی ئابی 2006 دووباره دەبێتەوە، بۆیە بڕیاری دەست لە کارکێشانەوەم دا، بە فەرمی داواکەم پێشکەش بە سەرۆکی پەرلەمان کرد.

**پ3/ ئێستا باس لەوە دەکرێت ئەو پرۆژە دەستوورەی لە تەممووزی 2009دا لە لایەن پەرلەمانەوە پەسندکراوە پەرلەمان جارێکی تر تەماشای بکاتەوە، چۆن لەوە دەڕوانن؟**

و3/ بەپێی پێڕەوی ناوخۆی پەرلەمان، (10) پەرلەمانتار دەتوانن داوای هەموارکردنی قانوون بکەن. جگەلەوەش، پەرلەمان ویلایەتی گشتی هەیە و دەتوانێ دەستکاری هەموو قانوونێك بکات، قانوونی پەسندکردنی پرۆژەی دەستووری هەرێم قانوونێکە وەکو قانوونەکانی تر، بۆیە پەرلەمان دەتوانێ داوای پێداچوونەوە بەو پرۆژەیە بکات پێش ئەوەی لەلایەن خەڵکی کوردستانەوە دەنگی لەسەر بدرێت و پەسند بکرێت. دەبێ ئەوەش لەبیر نەکرێت کە ئەو پرۆژە دەستوورەی لە مانگی نۆڤەمبەری 2002دا وەك "پرۆژە" لە لایەن پەرلەمانەوە پەسند کرابوو، لە ناوەڕاستی 2005دا لەسەر داوای ژمارەی قانوونیی پەرلەمانتاران، لیژنەیەکی تازە دروستکرا بۆ پێداچوونەوە بە پرۆژەکەی ساڵی 2002. ئەو لیژنە تازەیە هەر ئەو لیژنە کۆنەیە بوو، کە لە مانگی تەممووزی 2008 بە پرۆژە دەستوورەکە چووبووەوە، دواتر بە دوا شێوەی ئامادەی کردبوو. ئەگەر 10 پەرلەمانتار داوای پێکهێنانی لیژنەیەکی تازە بکەن بۆ پێداچوونەوە بە پرۆژەکەی ساڵی 2009، پەرلەمانیش دەنگی لەسەر بدات، ئەو دەستکارییانە لەسەر پرۆژەکە دەکرێن. چاکترە لیژنەیەکی تازە لە دەرەوەی پەرلەمان دروستبکرێت بۆ پێداچوونەوە بەو پرۆژەی کە لە مانگی تەممووزی 2008دا ئامادەکراوە، دواتر لە مانگی حوزەیرانی 2009دا دەنگی لەسەر دراوە. کەسانێك دەڵێن ئەو پرۆسەیە دەبێتە هۆی دواخستنی پەسندکردنی پرۆژەی دەستووری هەرێم، بەڵام کێ بوون داوای دواخستنی پەسندکردنی پرۆژەی دەستووریان بۆ هەرێم دەکرد، تا بکەوێتە پاش پەسندکردنی دەستووری عێراق؟ هەر ئەوان بوون دوو ساڵ کۆبوونەوەیان بە لیژنەی دەستووری نەکرد، ئەوەش بووە هۆی دواکەوتنی پەسندکردنی دەستوور بۆ مانگی حوزەیرانی 2009.

**پ4/ له یەكێك له ماددەكانی پرۆژەكه ئاینی ئیسلام هاوتەریب كراوه لەگەڵ دیموكراسییەتدا، پێت وانییه ڕازیكردنی هەردوو سەرچاوه له یەك كاتدا له هەندێك حاڵەتدا زەحمەته؟**

و4/ ئەو دەقه دەستوورییه له دەستووری عێراقەوه وەرگیراوه. ئەو مادده دەستوورییه به یەكێك له بنەما سەرەكییەكانی دەستووری عێراق دەدرێته قەڵەم، بۆیه ناكرێت له دەستووری هەرێمی كوردستاندا ماددەیەكی دەستووری هەبێ نەگونجاوبێت لەگەڵ ئەو بنەما سەرەكییانەی له دەستووری عێراقدا هەن.

**پ5/ لەمەڕ ئەو ڕێژەیەی كه 30٪ بۆ ئافرەتان دیاری كراوه، چەند له خزمەتی دیموكراسی و پرسی ئافرەتانه؟ هەروەها ئەو كۆتایانەی بۆ نەتەوەكانی تر دانراون بۆ پەرلەمانی كوردستان و ئەنجومەنی پارێزگاكان، لەگەڵ ئەو ڕێژەی 20٪ كورسییەكانی بەغدا كه كورد داوای دەكات، چەند لەگەڵ پێوەره نێودەوڵەتییەكان دەگونجێت؟**

و5/ دیاریكردنی كۆتا یان ڕێژەیێكی دیاریكراو له دەستوور یان له قانوونی هەڵبژاردندا لەسەر هەر بنەمایەك بێت، ناگونجێ لەگەڵ بنەماكانی دیموكراسی. بەڵام ئەو بارودۆخه سیاسییه تایبەتییەی له عێراقدا پەیدابووه لەئاكامی ئەو زوڵمه زۆرەی له ئافرەتان و له نەتەوه ناسەرەكییەكانی دیكەی عێراق كراون وادەخوازێ، بۆ چەند ساڵێكیش بێت، ڕێژەیەك بۆ ژنان و كۆتایەك بۆ ئەو نەتەوانه دیاری بكرێت، تا بتوانن نوێنەرانی خۆیان بنێرنه ناو پەرلەمان و ئەنجومەنەكانی دیكه، ئەگینا لەم بارودۆخەی كه ئێستای عێراق پێیدا تێدەپەڕێ ناتوانن نوێنەرانی خۆیان بنێرنه ناو ئەو دامەزراوانه بۆ ئەوەی داكۆكی له مافه ڕەواكانیان بكەن.

**پ6/ لەمەڕ كاری پەرلەمان پێویسته ئەمجاره چی بكرێت كه پێشتر نەكراوه له دەركردنی یاسا و چاودێری كارەكانی حكومەت و لێپێچینەوه، بەتایبەتی ئەمجاره ئۆپۆزسیۆن لەناو پەرلەماندا هەیه ؟**

و6/ میدیا زۆر جار باس لەوه دەكات له خولی دووەمی پەرلەمانی كوردستاندا دەنگی ناڕەزایی نەبووه. له ڕاستیدا دەنگی ناڕەزایی هەبووه بەڵام لاواز بوو، به شێوەی گشتی پەرلەمان لەژێر ڕكێفی هەردوو حیزبی سەرەكیدا بوو.

بەشێك له ئەندامانی ئەو دوو حیزبه سەرەكییه، لەگەڵ چەند ئەندامێكی حیزبه بچووكەكانی ناو پەرلەمان ڕەخنەیان دەگرت. جاروبار به بەشێكیانم دەگوت ئەوەی له

دانیشتنی تایبەتدا دەیڵێن چاكترە لەناو هۆڵی پەرلەمان بە دەنگی بەرز بیڵێن! بێگومان خولی سێیەمی پەرلەمان جیاوازە، چونكە بە فەرمی چەند فراكسیۆنێك لەناو پەرلەماندا هەیە، ئەوەش دەبێتە هۆی چاودێریكردنی كارەكانی حكومەت بەشێوەیەكی باشتر و دەتوانن بەشداری لە داڕشتنی قانوونەكان بكەن. بەشێك لەو پرۆژە قانوونانەی دەخرانە دەنگدانەوە جاروبار بە تەنیا هەرمن، یان لەگەڵ یەك دوو پەرلەمانتاری دیكە دەنگمان بۆ نەدەدا، چونكە كاریگەریی هیچ لایەنێكمان لەسەر نەبوو.

# زیندەبەچاڵکردنی دوو پرۆژە دەستووری ئامادەکراو بۆ هەرێمی کوردستان[1]

لە مانگی ئەیلوولی 1991دا دەزگاکانی حکومەتی بەعس لە "ناوچەی حوکمی زاتی" کشانەوە، حوکمڕانیکردنی ئەو ناوچانە کەوتە ژێر دەسەڵاتی "بەرەی کوردستانی" کە هەردوو دەسەڵاتی قانووندانان و ڕاپەڕاندنی ئەو ناوچەی بە خۆی دابوو، ئەوەش بە پێچەوانەی بنەما سەرەکییەکانە لە قانوونی دەستووری، چونکە دەسەڵاتی حوکمڕانیکردن و قانووندانان ناشێ بە دەست یەك لایەن بێت. ئەو سیستمە لە سەردەمی حوکمی بەعس کاری پێ دەکرا، "ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش" دەسەڵاتی حوکمڕانیکردن و قانووندانانی بە خۆی دابوو. ئەو بارودۆخەی لە کوردستان هەبوو دەبوو لەڕووی قانوونییەوە چارەسەر بکرێت. پێشنیازێکم خستە بەرچاو چەند بەرپرسێك، کە قانوونی حوکمی زاتی ساڵی 1974 کاری پێ بکرێت، تا قانوونی هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان لە لایەن بەرەی کوردستانییەوە پەسند دەکرێت. ئەو پێشنیازە بۆ ئەو دەمەی کوردستان زۆر گونجاو بوو، "ئەنجومەنی ڕاپەڕاندن" لە لایەن بەرەی کوردستانییەوە، کە دەسەڵاتی (ئەنجومەنی قانووندانەر) بوو، دەیتوانی سەرۆك و ئەندامانی (ئەنجوومەنی راپەڕاندن) لە کەسانی تێکنۆکرات و رابوردوو پاك دیاری بکات. قبووڵکردنی ئەو پێشنیازە دەبووە هۆی ئەوە، کە کاروباری ئەو ناوچەیە بەپێی قانوون بەڕێوە ببرێت، ئەوەش دەبووە هۆی ئەوە کە دەستێوەردانی حیزبەکان لە کاروباری حکومەتدا تا ڕادەیەك کەمتربێت. ئەو حیزبانە تازە لە شاخەوە هاتبوونە ناو شارەکان، ئەو ناوچانەی لەژێر دەسەڵاتیان بوون بە عەقڵییەتی شاخەوە بەڕێوەیان دەبرد. حوکمڕانیکردنی کوردستان لە لایەن بەرەی کوردستانییەوە بووە هۆی ئەوەی پاش هەڵبژاردنی پەرلەمان و دامەزراندنی حکومەتیش، حیزبە دەسەڵاتدارەکان ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بەردەوام بن لە دەستخستنە ناو کاروباری حکومەت و دەزگاکانی. لەو هەلومەرجەدا بوو، کە پرۆژەی دەستوورێکم بۆ هەرێمی کوردستان ئامادە کرد.

---

(1) (هاوڵاتی)، ژمارەی (461)، یەکشەممە 28ی ئەیلولی 2008

دەستوور شێوەی بەڕێوەبردنی کاروباری حکومـەت و ئـەرکی پەرلـەمان و دەسـەڵاتی دادوەری دیـاری دەکـات، لەگـەڵ مـاف و ئەرکـەکانی هاووڵاتییـان. پرۆژەکـە لـە مـانگی حوزەیرانی 1999دا، پێش ڕاگەیاندنی سیستەمی فیدراڵی ئامادەکرابوو، چونکە فیدراڵی دروشمی بەشی زۆری ئەو لایەنە سیاسییانە بوو، کە بەشدارییان لە هەڵبـژاردنی ئایاری 1992دا کرد. پرۆژەکە لە چاپخانەی زانکۆی سـەلاحەددین چاپ کـرا، پاشـان دابەشـکرا بەسەر ژمارەیەکی زۆر لە قانووننـاسانی کوردسـتان، تـا ڕا و سـەرنجی خۆیـان دەربـڕن و دەوڵەمەندتری بکـەن. لـە مـانگی تـەممووزی 1992دا بـە بڕیـاری پەرلـەمان دەسـتەیەکی قانوونی دروست کرا، کە ئەندامەکانی خوالێخۆشبوو کاك ڕەشید عەبدولقادر و بەندە و دکتـۆر عەبـدولڕەحمان ڕەحـیم بـووین. ئـەرکی ئـەو دەسـتە قانوونییـە ئامـادەکردنی پـرۆژەی قـانوون بـوو بـۆ پەرلـەمان، لەگـەڵ پێـشکەشکردنی ڕاوێـژکاریی قـانوونی بـۆ حکومـەت و پەرلـەمان. پڕۆژەکـە پـاش دەوڵەمەنـدکردنی بـە ڕا و سـەرنجی بەشـێك لـە قانووننـاسانی کوردسـتان، خرایـە بـەردەم ئـەو دەسـتە قانوونییـە، بـە هاوکـاریی چـەند قانووننـاسـێك جـارێکی تـر تەماشـاکرایەوە، پاشـان بـە نووسـراوێکی فـەرمی ڕەوانـەی سەرۆکایەتی پەرلەمان و حکومەتی هەرێم و سـەرۆکی هـەردوو حیزبـی سـەرەکی کـرا. بارودۆخی سیاسی لە کوردستان بووە هۆی ئەوە پرۆژەکـە نەخرێتـە بـەردەم پەرلـەمان، هەرچـەندە 33 پەرلـەمانتار لـە هـەردوو فراکـسیۆنە سـەرەکییەکەی داوایـان لـە سـەرۆکایەتی پەرلـەمان کردبـوو پرۆژەکـە گفتوگۆی لەسـەر بکرێـت بـۆ ئـەوەی پەسـند بکرێـت. خـەڵکێکی زۆر لـە نـاوەوە و لـە دەرەوەی کوردسـتان داوای پەسـندکردنی دەستووریان دەکرد، بەڵام شەڕی ناوخۆ کە لە ناوەڕاستی ساڵی 1994 تـا 1998 درێـژەی کێشا بووە هۆی ئەوە پرۆژە دەستووری ساڵی 1992 لەبیر بکرێـت. بـەو جـۆرە یەکـەمین پرۆژە دەستووری هەرێم کە لەسەر بنەمای فیدراڵیزم بـۆ هـەرێمی کوردسـتان پێـشنیاز کرابوو، زیندەبەچاڵ کرا. بەڵام لەسەر ئاستی دەرەوەی کوردستان پرۆژەکە کاری لەسەر دەکرا. بۆ نموونە، لە کۆنفرانـسێکی زانـستیی نێودەوڵـەتی، کـە لـە زانکـۆی (پرنـستن)ی ئەمریکی لە ئەیلوولی 1994دا بەسترا، بابەتێکم لەبارەی ئەو پرۆژەیـەوە پێـشکەش کـرد و گفتوگـۆی لەسـەرکرا. چـەندین پـسپۆری ئـەمریکایی پێـشنیازی چـاکیان بـۆ دەوڵەمەنـدکردنی پێـشکەش کـرد، بـەڵام بەشـی زۆری ئـەو عێراقییانـەی سـەر بـە لایەنـەکانی ئۆپۆزسـیۆن بـوون، ناڕەحـەت بـوون لـە پێـشکەشکردنی ئـەو بابەتـە. لـە

بەریتانیا پرۆژەکە کرایە ئینگلیزی و دابەشکرا بەسەر چەندین ناوەند و زانکۆدا، چەند بابەتێك لەسەر پرۆژەکە لەسەر سایتەکان بڵاوکرانەوە.

لە نیسانی 2002دا بۆ بەشداریکردن لە کۆنفرانسێکی تایبەت بە ئەنفال سەردانی کوردستانم کرد. پێش بەستنی کۆنفرانسەکە دیداری جەنابی کاك مەسعود بارزانیم کرد. لەو دیدارەدا ئاگاداری کردم کە دوو پرۆژەی دەستووریان بۆ عێراق و هەرێمی کوردستان ئامادە کردووە و هەردوو پرۆژەکەی پێدام، گوتیشی پرۆژەکەی هەرێم لەسەر بنەمای پرۆژەکەی ساڵی 1992 ئامادەکراوە، داواشی لێکردم هەر تێبینییەکم لەسەر پرۆژەکە هەبێت، بە نووسراوی بۆی بنێرم. لەو ماوەیەی لە کوردستان بووم، تێبینییەکانم بە نووسراوی بۆ نارد، لەگەڵ نامەیەکدا کە تێیدا ئامادەیی خۆم پیشاندابوو بۆ هاوکاریکردنی ئەو لیژنەیەی پرۆژەکەی ئامادە کردووە. لە مانگی نۆڤەمبەری ساڵی 2002دا ئەو دوو پرۆژەیە هەردووکیان بڵاوکرانەوە، خۆم بە پرۆژە دەستووری عێراق مەشغووڵ نەکرد، بەڵام ئەو پرۆژەی بۆ هەرێمی کوردستان ئامادە کرابوو، بە وردی پێیداچوومەوە و دەرکەوت کەموکوڕی تێدایە. لەبەر ئەوەی هەردوو پرۆژەکە بە زمانی عەرەبی داڕێژرابوون، تێبینییەکانم لەسەر پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان لە هەفتەنامەی (الاتحاد)، لە ناوەڕاستی نۆڤەمبەری 2002دا بڵاوکرایەوە. ئەو پرۆژەیە لەلایەن پەرلەمانەوە، تەنانەت وەکو دەستوورێکی کاتییش دەنگی لەسەر نەدرا، بۆیە هەر وەکو "پرۆژە" مایەوە، ئەوەش لە ڕووی قانوونییەوە کارێکی نادروست بوو، چونکە ئەگەر پرۆژەیەك بخرێتە بەردەم پەرلەمان، دەبێ بڕیاری لەسەر بدرێت، وەك قانوون، یان بڕیار، بۆیە پرۆژەکە سیفەتێکی قانوونی وەرنەگرت. لەو ماوەی لە هەولێر بووم پەیامنێری گۆڤاری (گوڵان) چاوپێکەوتنێکی لەگەڵما سازکرد، تێیدا پرسیاری پرۆژەی دەستووری ساڵی 92ی لێکردم، لە وەڵامدا گوتم "پەرلەمانی کوردستان سیستمی فیدراڵی پەسند کردووە، دەبوو ماوەیەکی کەم پاش ئەو بڕیارە دەستوورێك بۆ هەرێمی کوردستان پەسند بکات، چونکە ناتوانین ئەو دەسەڵاتانەی لە هەرێمی کوردستان بە شێوەیەکی قانوونی بەڕێوەیانبەرین ئەگەر دەستوور نەبێت، دەستوور وەك دەگوترێ باوکی قانوونەکانە، هەموو قانوونێك دەبێت بەپێی دەستوور بێت" (گوڵان، ژمارەی 378، 18ی نیسانی 2002). پاش بڵاوکردنەوەی ئەو چاوپێکەوتنە، لە ژمارەی دواتری ئەو گۆڤارە، پرسیار لە سکرتێری پەرلەمان

کرابوو، کە ئێستا سەرۆکی لیژنەی دەستوورییە لە پەرلەمانی کوردستان سەبارەت بە بۆچوونەکانم، ئایا پێویستە هەرێمی کوردستان دەستووری خۆی هەبێت؟ وەڵامی ئەوەبوو: "پێویستمان بە دەستوور نییە، چونکە چەندین قانوونی دەستووریمان لە هەرێمدا هەیە".

لە مانگی دیسەمبەری 2003دا پرۆژەیەکی تر ئامادە کرا، کە لە ڕاستیدا پرۆژەکەی نۆڤەمبەری ساڵی 2002دا بوو، بەڵام چاککرابوو لەلایەن لیژنەیەکەوە کە ئەندامانی پێکهاتبوو لە ئەندامانی لیژنەی قانوونی خولی یەکەمی پەرلەمان و بەندە و کاك فورسەت ئەحمەد، سکرتێری پەرلەمان. بەداخەوە ئەو پرۆژەش وەك پرۆژەکەی ساڵی 1992 زیندەبەچاڵ کرا، بە پاساوی ئەوەی وەکو "پرۆژە"کەی ساڵی 2002 پەسند نەکراوە، کە لە کۆی زیاتر لە 20 حیزبی کوردستانی دەنگیان لەسەرداوە، هەرچەندە سیفەتێکی قانوونی وەرنەگرتبوو. هەموو پرۆژەیەك ئەگەر بڕیاری لەسەر نەدرێت وەکو پرۆژە دەمێنێتەوە. ئەگەر پەرلەمانی کوردستان نیازی پەسندکردنی ئەو پرۆژەی هەبوایا، دەبوو دەنگی لەسەر بدات. پرسیارێکی تر لێرەدا دێتە پێش، ئەویش ئەوەیە ئەگەر ئەو پرۆژەیە سیفەتی قانوونی وەرگرتبێ بۆچی ئەو کەسانەی بەشدارییان لەئامادەکردنی کردبوو، جارێکی تر بەشدارییان لەو لیژنەیە کردەوە، کە لە هاوینی 2003دا بە هەمان پرۆژەی 2002دا چوونەوە؟ قانووننناس ئەگەر بەگومان بێت لە کارێك، یان لە شێوەی کارکردنی لیژنەیەك، پێویستە بێ دەنگ نەبێت. هەموو ئەندامانی لیژنەی قانوونی لە خولی یەکەمی پەرلەماندا، کە سەرۆکەکەی خوالێخۆشبوو کاك سەعید یەعقووبی بوو، لەگەڵ ئەندامانی دیکەی ئەو لیژنەیە، بەتایبەتی کاکەڕەش نەقشبەندی و کاك نیعمەت محەمەد و چەند ئەندامێکی تر چالاکانە بەشدارییان لە کارەکانی لیژنەی پێداچوونەوە بە پرۆژەکەی 2002 کرد، بە کاك فورسەت ئەحمەدیشەوە کە سکرتێری پەرلەمان بوو.

لە کۆتایی مانگی حوزەیرانی 2005دا و پێش ئامادەکردنی پرۆژەی دەستووری عێراق، (59) پەرلەمانتار لە هەموو گرووپەکان بە ڕەسمی داوایان لە سەرۆکایەتی پەرلەمان کرد پرۆژەی دەستووری ساڵی 2003 بکرێتە بنەما بۆ دارشتنی پرۆژەیەکی نوێ بۆ هەرێمی کوردستان. ئەو داواکارییە نەخرایە بەردەم پەرلەمان تا دەستووری عێراق پەسند کرا، کاتێکیش خرایە بەردەم پەرلەمان، دەستەی سەرۆکایەتی خولی

دووەم پێشنیازی کرد پرۆژەکەی 2002، واتا پرۆژە کۆنەکە بکرێتە بنەما نەك پرۆژە تازە چاککراوەکەی 2003.

بۆ مێژوو پێویستە هەندێ ڕووداو ڕاشکاوانە بخرێنە بەرچاو سەبارەت بە چۆنیەتی ئامادەکردنی پرۆژەی دیسەمبەری 2003.

لە ئەیلوولی 2003دا یاداشتنامەیەکم پێشکەش بە سەرکردایەتی سیاسیی کوردی کرد، تێیدا داوای یەکخستنەوەی هەردوو ئیدارەکەم کردبوو، لەگەڵ دامەزراندنی لیژنەیەکی تایبەت بۆچارەسەرکردنی کێشەکانی کەرکووك و چاوگێڕانەوە بە پرۆژەی دەستووری نۆڤەمبەری 2002 تا بگونجێ لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییانەی لە عێراق ڕوویاندابوو بە هۆی ڕووخانی رژێمی بەعسەوە. مەبەستی سەرەکی ئەوەبوو سەقفی داواکارییەکانی کورد زیاتر بکرێن، چونکە لەو پرۆژە دەستوورەی هەرێم کە لە نۆڤەمبەری 2002دا ئامادەکرابوو، بەوجۆرە نەبوو. ئەو پرۆژەیە لە سەردەمی حوکمی بەعس ئامادە کرابوو، کەموکورتی دیکەی تێدابوو. لەو داواکارییەی کە ئەو 59 پەرلەمانتارانە پێشکەشیان بە سەرۆکایەتی پەرلەمان کردبوو، داواکرابوو پرۆژەکەی 2003 بکرێتە بنەما و پێداچوونەوەی پێدا بکرێت، پاشان پەسند بکرێت پێش پەسندکردنی دەستووری عێراق. مەبەست ئەوەبوو کە داواکارییەکانی گەلی کوردستان بە ڕوونی لە دەستووری هەرێمی کوردستان دابڕێژرێن، هەوڵبدرێت ناوەرۆکەکەی لەناو پرۆژە دەستووری عێراقدا بچەسپێنرێن. سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران لەوەدا هاوکاری کردین، هەموو ئەندامانی لیژنەی قانوونی خولی یەکەمی پەرلەمان و کاك فورسەت ئەحمەد و بەندە پێکەوە بانگ کراین بۆ کۆبوونەوەیەك لە سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران. لەو کۆبوونەوەیەدا هەموو ئامادەبووان هاوڕابووین لەسەر دەستکاریکردنی پرۆژەکەی نۆڤەمبەری ساڵی 2002، تا گونجاو بێت لەگەڵ بارودۆخی تازەی عێراق. هەر لەوێدا بڕیاردرا لیژنەی قانوونی و من و کاك فورسەت رۆژی پاشتر لە پەرلەمان کۆببینەوە بۆ تەواوکردنی ئەو ئەرکە قانوونییە. لە رۆژی دیاریکراودا، بە ئامادەبوونی بەشێکی زۆر لە ئەندامانی لیژنەی قانوونی، کۆبوونەوە سازکرا، لە ماوەی چەند سەعاتێکدا بەتێکڕای دەنگی ئامادەبووان بڕیاری دەستکاریکردنی چەند ماددەیەك درا. بۆ نموونە، مافی دیاریکردنی پاشەڕۆژی گەلی کوردستان بەڕوونی لە پرۆژەکەدا چەسپێندرا، ناوی (ئەنجوومەنی نیشتیمانی کوردستانی) کرا بە"پەرلەمانی کوردستان"،

لەگەڵ دەستکاریکردنی چەند ماددەیەکی دیکەدا. کاک فرسەت ئەحمەد لە سەرەتای کۆبوونەوەکە ئامادە نەبوو، پاشان ئەو دەستکارییانەی بڕیاریان لەسەردرابوو بۆمان ڕوون کردەوە، بەڵام داوای لێ کردم بەنووسراوی لێکۆڵینەوەیەك لەسەر ئەو دەستکارییانەی پێشنیازیان دەکەم، بۆی ئامادە بکەم. پرسیارم لێکرد بۆچی لەو کۆبوونەوەی ڕۆژی پێشتر لە ئەنجومەنی وەزیراندا بەسترا ئەو داواکارییەی نەخستە بەرچاو؟ گوتم ئێستا هەمووومان پێکەوە خەریکین ماددە بە ماددە بە پرۆژەکەدا دەچینەوە، ئەو ماددەی پێویست بەدەستکاریکردن بکات، پاش بیروڕا گۆڕینەوە و بە تێکڕای دەنگی ئامادەبووان دەستکاری دەکرێت، ئەگەر پێویست بکات. ئامادەکردنی ئەو لێکۆڵینەوەیە کاتی دەوێ، ئەوەش دەبێتە هۆی دواکەوتنمان لە تەواوکردنی ئەو ئەرکەی پێمان سپێررابوو، بەڵام ئەو هەر سووربوو لەسەر داواکارییەکەی. ناچاربووم لە ماوەی دوو هەفتەدا ئەو دیراسەیە ئامادەبکەم و بەچاپکراوی بۆ لیژنەکەم نارد، لەگەڵ نامەیەکدا کە تێیدا پێشنیازم کردبوو، پاش هەفتەیەکی تر لیژنەکە کۆببێتەوە. لە ڕۆژی دیاریکراودا چوومەوە بۆ پەرلەمان، ئەمجارە کاك فورسەت بیانوێکی تری هەبوو، گوتی ناتوانین لەسەر کارەکانمان بەردەوام بین، چونکە ڕەزامەندی سەرۆکی پەرلەمان وەرنەگیراوە! جارێکی تر پێمگوتەوە بۆ لەو کۆبوونەوەی لەگەڵ سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیراندا کرا ئەو ئیعترازەی نەخستە ڕوو؟ ئەو بەیتە شیعرەی شێخ رەزام بۆ هات کە دەڵێت: "من دەزانم کێ لەخشتەی بردووی ئەمما چ سوود..." پەرلەمان لەو کاتەدا لە پشووی هاوینەی بوو، د. رۆژ شاوەیس، کە سەرۆکی پەرلەمان بوو، لەگەڵ د. کەمال فوئاد جێگرەکەی، هەردووکیان لە دەرەوەی وڵات بوون. هەمووومان 35 رۆژ چاوەڕێی گەڕانەوەی یەکێك لەو دوو بەرپرسەی پەرلەمانمان کرد، پرسیاری ئەوەشم لێ کردن ئایا دەکرێ کاروباری پەرلەمان لەبەر سەفەری سەرۆکەکەی یان جێگرەکەی ڕابوەستێ؟ پاش گەڕانەوەی دکتۆر رۆژ، ئاگادار کرامەوە کە دەیەوێ چاوی پێم بکەوێت. زۆر خۆشحاڵ بوو بەو کارەی دەستمان پێکردبوو، داواشی لێ کردم بەردەوام بین لەسەر کارەکەمان. هەرچەندە ئەو ماوە زۆرەمان لەدەست چوو، بەڵام لەماوەییێکی کەمدا ئەو بەشەی لە پرۆژەکە تەماشا نەکرابوو، پێیدا چووینەوە و کارەکانمان تەواوکرد. لە مانگی دیسەمبەری 2003دا بە چاپکراوی پرۆژەکەم ڕادەستی سەرۆکی لیژنەی قانوونی و سەرۆکایەتی پەرلەمان و چەند لایەنێکی دیکەی پەیوەندیدار کرد. ئەو پرۆژەیە بوو

کە 59 پەرلەمانتار لە کۆتایی مانگی حوزەیرانی 2005دا داوایان کرد گفتوگۆی لەسەر بکرێت، بە ئومێدی پەسندکردنی پێش پەسندکردنی دەستووری عێراق. هۆی پەلەکردنمان لە پەسندکردنی دەستووری هەرێمی کوردستان پێش دەستووری عێراق لەبەر ئەوەبوو، ئەگەر دەستووری کوردستان پێشتر پەسند بکرێت و بکرێتە بنەما بۆ داواکارییەکانی گەلی کوردستان، دەکرا بەشی زۆری ماددەکانی لەناو دەستووری عێراقدا بچەسپێنرێن، بەلاّم لەبەر ئەوەی ئەو کارە لە کاتی خۆیدا ئەنجام نەدرا، لەپاش پەسندکردنی دەستووری عێراق کورد بەستراییەوە بەو ماددە حەسرییانەی لەو دەستوورەدا نووسران، چونکە ناکرێت ماددەیەك لە دەستووری هەرێم بەپێچەوانەی ئەو ماددە حەسرییانە بێت.

پرۆژەی ساڵی 1992 و پرۆژەی دیسەمبەری 2003 هەردووکیان لەبەر هۆکاری جیاواز زیندەبەچاڵ کران، "هۆکاری" زیندەبەچاڵکردنی پرۆژەی دووەم زاتی بوو، پەیوەندی بە بارودۆخی کورستانەوە نەبوو. هەموو ئەو کارانەی پەیوەندییان بەچۆنیەتی ئامادەکردنی ئەو دوو پرۆژەیەوە هەیە، لەگەڵ دەقەکانیان لە نامیلکەیێکدا لە لایەن دەزگای (رەنج) لە ساڵی 2005 بلاّوکرایەوە. ئەو نامیلکەیەم دابەش کرد بەسەر هەموو ئەندامانی پەرلەمانی کوردستان لە خولی دووەمدا، ئەوەش بووە هۆی داواکاریی ئەو 59 پەرلەمانتارە، کە پێشکەشیان بە سەرۆکایەتی پەرلەمان کرد لە مانگی حوزەیرانی 2005دا.

لە هەردوو پرۆژە دەستووری 1992 و دیسەمبەری 2003 ڕەچاوی ئەو راستییە کراوە، کە لە سیستمی فیدراڵیدا هەندێك دەسەلاّت تایبەتن بە حکومەتی ناوەند، لەگەڵ چەند دەسەلاّتێکی دیکەی تایبەت بە هەرێمەکان. لە پرۆژەی دەستووری نۆڤەمبەری 2002دا چەند ماددەیەك بوونە مایەی کێشە دروستکردن بۆ کورد. بۆ نموونە، لەو پرۆژەیەدا کەرکووك کرابووە پایتەختی هەرێمی کوردستان، ئەوەش ناحەزانی کوردی زۆر نارەحەت کرد. بڕوا ناکەم لە کوردستاندا کەسێك هەبێ بە قەد من پێی خۆش بێت کەرکووك بکرێتە پایتەختی هەرێم، بەلاّم ئەو کارە نە ئێستاو نە لە ئایندەیێکی نزیکدا ناکرێت. لە پرۆژەی ساڵی 92دا پێشنیازکراوە هەولێر بکرێتە پایتەخت، لە ڕووی قانوونییەوە تا کەرکووك نەخرێتە سەر سنووری هەرێمی کوردستان، نابێ

بکرێتـە پایتـەخت، مەگـەر لەسـەر کاغـەز! ناحـەزانی کـورد پڕۆپاگەندەیـەکی زۆریـان بڵاوکردەوە لەبارەی ئەو پێشنیازەوە، لەوەدا هەر کورد زەرەرمەند بوو.

ئەو لیژنەی خەریکی پێداچوونەوە بوو بـەو پـڕۆژە دەسـتوورەی لـە ئـەیلوولی سـاڵی 2006دا بڵاوکرایـەوە، لـە مـاوەی نزیـك دوو سـاڵدا کۆنـەبووەوە بـۆ تەماشـاکردنی ئـەو پێشنیازانەی چـەندین ڕێکخـراوی سیاسـی و مـەدەنی و کەسـانی پـسپۆڕو شـارەزا بۆیـان ناردبوو. لەو باوەڕەدام ئەگەر ئەو لیژنەیە ڕێگای چۆڵ بکردبا بۆ لیژنەیەك کە بتـوانێ بە وردی تەماشای هـەموو ئـەو پێـشنیازانە بکـات، لەگـەڵ ئـەو پێـشنیازانەی لایـەنێکی بیانی ئامادەیان کردبوو بۆ چاککردنی پرۆژەکـە، کـە ئاگـاداری کارەکانیـانم، چـونگە لـە ژێـر چـاودێریی مـن کارەکانیـان لـە ئیگلیزییـەوە کراونەتـە کـوردی، پرۆژەکـە دوا نەدەکەوت. بەم شێوەیە پرۆژەیێکی باشـتر بـۆ هـەرێمی کوردسـتان ئامـادە دەکـرا، پـێش ئەوەی دەنگ لەسەر پرۆژەی دەستووری عێراق بدرێت.

دەستوور بۆ هەر ئەمڕۆی کوردستان نییە، بۆ نەوەکانی پاش ئێمەیە. هەنـدێ خـاڵی سەرەکی هەن ئەگـەر نـەتوانین بـەو شـێوەی دەمانـەوێت دایانڕێـژین، وەك دیـاریکردنی سنووری هەرێمی کوردستان، چاکترە باس نـەکرێت، چونکە دەستنیـشانکردنی سـنووری هـەرێم لـە دەسـتووری کوردسـتاندا وەك دانپێـدانانی یـەکجارەکی دەبێـت بـەو سـنوورە، ئەگەری ئەوەش هەیە لەم بارودۆخەی ئێستای عێراقدا نەتوانین هەموو ئەو ناوچـانەی بە بەشێك لەخاکی کوردستانی دەزانین، بیانخەینە سەر سـنووری هـەرێم. لـەم حاڵەتـدا نەوەی پاش ئێمە پابەند دەبن بەو سنوورەی لە دەستووری کوردستاندا دیاری دەکرێت، کە ئەگەری ئەوە هەیە سنووری راستەقینەی کوردستان نەبێت. یەکێك لەو هەڵانەی لە پـڕۆژەی ئـەیلوولی 2006دا کـراوە ئەوەیـە، کـە مـاددەی 140ی کراوەتـە بنـەما بـۆ دیاریکردنی سنووری سیاسی هەرێمی کوردستان، لە کاتێکدا ئەو ماددەیە بـۆ نەهێـشتنی ئاسەواری سیاسەتی بەعەرەبکردن لەکوردستان داڕێژراوە، بەپێی ئەو میکانیزمـەی لـەو مـاددەدا دیـاری کـراوە. ئامـاژەکردن بـۆ ئـەو ماددەیـە بـۆ ئـەو مەبەسـتە دەبێتـە هـۆی بچووككردنەوەی، لەکاتێکدا ریژەییێکی زۆر لە دەنگدەرانی کوردستان لەبەر ئەو ماددەیە دەنگیان بۆ دەستووری عێراق داوە. چاکترە لـە پـڕۆژەی دەسـتووری هـەرێمی کوردسـتان سـنووری کوردسـتان بـە چـەند دەسـتەواژەیەکی گـشتی دیـاری بکرێـت، وەك ئـەوەی بنووسرێت: "سنووری هەرێمی کوردستان ئەو ناوچانە دەگرێتەوە، کە لـە ڕووی مێـژوو

و جوگرافیاوە بەشێکن لە خاکی کوردستان". دەوڵەت هەیە 60 ساڵە هەیە، بەڵام تا ئێستا سنووری سیاسی بۆ خۆی دیاری نەکردووە، وەك ئیسرائیل. فەرەنسا لە سییەکانی سەدەی ڕابوردوودا هەردوو لیوای (ئیسکەندروونە) و (ئەنتاکیای) دایە تورکیا، بەڵام سوریا ئێستاش ئەو دوو لیوایە بە بەشێك لە خاکی خۆی دەزانێت و دەستکاری سنووری وڵاتەکەی نەکردووە. سەبارەت بە مافی ئەو نەتەوانەی لە کوردستان دەژین، چاکترە لەگەڵ نوێنەرانی ئەو نەتەوانە دانیشتن بکرێت بۆ بیروڕاگۆڕینەوە و ئاگاداربوون لە داواکارییەکانیان. ناوچەی کەرکووك لە پرۆژەکەدا پێویستە بە بەشێك لە هەرێمی کوردستان پێناسە بکرێت، بەڵام لە چوارچێوەی حوکمێکی ئۆتۆنۆمیی فراواندا. لە دانیشتنێکدا لەگەڵ بەرپرسێکی ئەمریکی بۆ کاروباری (باکوری) عێراق، باڵیۆز تۆماس کراجێسکی، کە بۆ قسەکردن لەسەر ماددەی 140، لە کۆتایی مانگی ئابی 2008دا سەردانی کوردستانی کرد، ڕاشکاوانە پێمڕاگەیاندن کورد لەوە کەمتر قبووڵ ناکات، کە ناوچەی کەرکووك بێتە بەشێك لە هەرێمی کوردستان، بەڵام وەك ناوچەیەکی ئۆتۆنۆم دەسەڵاتێکی فراوانی پێ بدرێت. هەمان بۆچوونم لەگەڵ بەرپرسێکی پایەبەرزی بەریتانی دووپات کردەوە، کە دواتر سەردانی کوردستانی کرد.

ئەمانە چەند بۆچوونێکن دەیانخەمە بەرچاو ئەو لیژنە قانوونییەی پێشنیازی دامەزراندنی دەکەم، کە دەتوانێت زیاتر لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکات. گوێ شل نەکردن بۆ ڕا و بۆچوونی کەسانی پەیوەندیدار، بەتایبەتی لە بواری دارشتنی پرۆژەی دەستوور کارێکی باش نییە و ئەنجامەکەی خراپ دەبێت بۆ ئەمڕۆی کوردستان و بۆ دوارۆژی. پاشەڕۆژی ناوچەی کەرکووکمان لەبەرچاوە، کە ئێستا بە چ قۆناغێکی مەترسیدار گەیشتووە. ئەو هەڵانەی بوونەتە هۆی دروستبوونی ئەو بارودۆخە ناهەموارە لە کەرکووك، با لە دارشتنی پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان دووبارە نەکرێنەوە.

# چەند پرسیارێکی (کوردستان ڕاپۆرت) سەبارەت بە پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان [1]

**پرسیار: بە شێوەی گشتی ئێوە لەسەر پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان چ ڕەخنەیەکتان هەیە؟ وەك ئاگادارین ئێوە ڕەخنەتان لە تەرجومەی پرۆژەکە هەیە، دەکرێ ڕەخنەکانتان لەو بارەیەوە دیاری بکەن؟**

وەڵام: دەستووری هەرێمی کوردستان بەڵگەنامەیەکی گرینگە نەك تەنیا لەسەر ئاستی ئەم بەشە رزگارکراوەی کوردستان، بەڵکو لەسەر ئاستی هەموو بەشەکانی دیکەی کوردستان، بۆ ئەمڕۆ و پاشەڕۆژی. لە دەستووردا شێوەی حوکمڕانیکردنی وڵات دیاری دەکرێت، ئەگەر بە شێوەیێکی نادیموکراسییانە و نەگونجاو دابڕێژرێت، دەکەوینە بەر لۆمە و لەعنەتی نەوەی پاشەڕۆژی گەلەکەمان. بەشێك لە ڕەخنەکانم قانوونین، بەشێکی دیکەیان پەیوەندییان بە شێوەی کارکردنی لیژنەی ئامادەکردنی پرۆژەکەوە هەیە. بۆ نموونە، وەرگێڕانی پرۆژەکە لە عەرەبییەوە بۆ کوردی کە بە من سپێردرابوو، بە خۆشحاڵییەوە ئەو ئەرکەم لە ئەستۆ گرت و چەند هەفتەیەك خەریکی ئەو کارە بووم بە هاوکاری چەند دۆستێکی زمانزان. ترسی ئەوەم بوو ئەو ئەرکە بە کەسێکی تر بسپێردرێ، پاشان بڵێن زمانێکی قانوونی گونجاومان نییە و چاوتان لەو کوردییە ناقۆڵایە بێ کە ئەو دەستوورەی پێ نووسراوەتەوە! لە 20ی حوزەیرانی 2006دا پرۆژەکەم وەرگرت، بەڵام بۆم دەرکەوت چەند کەموکورتییێکی قانوونی تێدایە. لەسەر پرۆژە عەرەبییەکە، بە خەتی سوور سەرنجەکانم نووسی، کۆپیم کرد و دابەشم کردن بەسەر ئەو ئەندامانەی لەو کۆبوونەوەدا ئامادەبوون. وەڵامی سەرۆکی لیژنەکە ئەوەبوو تازە ناتوانین دەستکاری ماددەکانی پرۆژەکە بکەین، چونکە دەنگیان لەسەر دراوە. بەڵام لە 22 ئابی 2006، لە کاتی پشووی پەرلەماندا، لیژنەکە کۆبوونەوەیەکی دیکەی ئەنجامدابوو بە ئامادەنەبوونی نزیکەی سێیەکی ئەندامانی. لەو کۆبوونەوەدا 22 ماددەو بڕگەی نوێ خرابوونە سەر پرۆژەکە، یان دەستکاری کرابوون. هەردوو پرۆژەکەم لەبەردەستایە، ئەوەی 20ی حوزەیرانی 2006، لەگەڵ پرۆژەکەی 22 ئابی 2006. لە 11ی ئەیلوولی ئەو ساڵە تەواوی پرۆژەکەم بە کوردی دایە لیژنەکە. لەوە

---

(1) (کوردستان ڕاپۆرت)، 8ی ئۆکتۆبەری 2006.

دەچێ داوا لە چەند ئەندامێکی لیژنەکە کرابێ، تا بە وەرگێڕانی پرۆژەکەدا بچنەوە، ئەوەش کارێکی باش بوو، بەڵام دەبوو ئاگادار بکرێمەوە، تا منیش هاوکارییان بکەم و پێکەوە ئەو کارە ئەنجام بدرێت. بەشداری نەکردنم لەو پێداچوونەوە بووە هۆی ئەوە چەند هەڵەیێکی زمانەوانی لە تێکستە کوردییەکەدا بکرێت. هۆی ئەو هەڵانە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەو ئەندامانە تێکستە عەرەبییەکەیان بە دەقاودەقی کردووە بە کوردی، کە ئەوەش کارێکی راست نییە، چونکە زمانی کوردی تایبەتمەندیی خۆی هەیە.

**پرسیار: پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان لە رووی یاساییەوە چۆن دەبینی، مەبەست لایەنی داڕشتنەکەی و ریزبەندیی بەش و مادده و بڕگەکانی، دیباجە و دەقە وەرگێڕاوەکەی، لەم رووەوە هیچ کەلێن و کورتهێنانێك بەدی دەکەن؟**

وەلام: لە پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستاندا کۆمەڵێك بنەمای زۆر چاك چەسپێندراون، بەڵام بەشێکیان بە شێوەیەکی گونجاو دانەڕێژراون، یان دەبوو ڕستەکان کورتتر بن، یان دابەش بکرێن بەسەر چەند بڕگەیەکدا. دەبێ ئەوەش لەبیر نەکرێت کە ئەم دەستوورە لە پاش پەسندکردنی دەستووری عێراق ئامادە کراوە، ئەو ئازادییەی پێشتر کورد هەیبوو، ئێستا کەمترە. دەستووری عێراق، بەتایبەتی لە ماددەی 110دا، چەند دەسەلاتێکی حەسری بە حکومەتی ناوەندی داوە، بۆیە ناکرێت لە دەستووری هەرێمدا دژایەتی ئەو ماددەیە بکرێت. بەشێك لە ماددەکانی پرۆژەکە لە جێگای خۆیاندا نەهاتوون، بەشێکی دیکەشیان زیادن و نەدەبوو لە دەستووردا بن، چونکە لە دەستووردا تەنیا بنەما سەرەکییەکان دەنووسرێن، وردەکارییەکان بۆ قانوون دەهێڵرێنەوە. من وشەی (قانوون) بەکاردێنم، نەك (یاسا)، کە وشەیەکی تورکی مەغۆڵییە، وشەی قانوون لە (کانۆنیمۆس)ی یۆنانییەوە هاتووە، ئەمە بۆچوونی من نییە، هی مامۆستا (تۆفیق وەهبی)یە، کە خۆی لەسەرەتادا وشەی یاسای بەکارهێنابوو، بەڵام پاشان پەشیمان بووەتەوە و وشەی (قانوونی) بەکار دەهێنا. سەبارەت بە "دیباجە"ی پرۆژەکە، کە دەبوو بە "پێشەکی" ناوببرێت، دوورو درێژە، (پێشەکی)یێکی کورتترم خستە بەرچاو لیژنەکە، بەڵام تەماشا نەکرابوو، ئەو "پێشەکی"یەش بڵاو دەکەمەوە.

**پرسیار: رووە ئیجابی و باشەکانی پرۆژەی دەستوورەکە لە چیدا دەبینی؟**

وەڵام: چەند بنەمایێکی گرینگ لە پرۆژەکەدا چەسپێندراون، وەك دیاریکردنی سنووری هەرێمی کوردستان بەپێی مێژوو و جوگرافیا، هەرچەندە لە بڕگەی دووەمی هەمان ماددەی دووەمدا پشت بە ماددەی 140ی دەستووری عێراق بەستراوە بۆ دەستنیشانکردنی سنووری سیاسی هەرێم. ئەمە بە بۆچوونی من راست نییە، چونکە ئەو ماددەیە بۆ نەهێشتنی ئاسەواری سیاسەتی بە عەرەبکردنی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی حکومەتی عێراق داڕێژراوە، نەك بۆ دیاریکردنی سنووری هەرێمی کوردستان. دەبێ ئەوەش لەبیر نەکرێت، کە ناحەزانی کورد هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدان کۆسپ لەبەردەم جێبەجێکردنی ماددەی 140 دروست بکەن، ماوەیێکە باس لە دواخستنی جێبەجێکردنی ئەو ماددەیە دەکرێت، لە ناوەوەی عێراق و لە دەرەوەشدا.

داننان بە مافی چارەنووس بۆ گەلی کوردستان و چەسپاندنی بنەمای دامەزراندنەوەی دەوڵەتی عێراق – بەو شێوەی من پێشنیازی نووسینەوەی ماددەی هەشتم کردووە – لەسەر بنەمای رێککەوتنی ئارەزوومەندانە، لەگەڵ مافی داواکردنی راپرسی لە لایەن سەدا بیست و پێنجی ئەو کەسانەی مافی دەنگدانیان لە کوردستاندا هەیە و چەند بنەمایێکی دیکە، هەموویان دەسکەوتی زۆر چاکن.

**پرسیار: دەستوور کە چەتری هەرە باڵای یاساکانی ترە لە وڵات، وەکو دەقێکی یاسایی پێویستە نوخبەی شارەزایانی بواری یاسایی بۆ تەرخان بکرێ و کاری بۆ بکەن، ئەم ئەزموونە نۆبەرەی گەلی کوردستانە لە بواری دەستوورنووسیندا چۆن هەڵدەسەنگێنی بە بەراورد لەگەڵ ئەزموونی وڵاتانی تر؟**

وەڵام: لە ساڵی 1992دا پرۆژەی دەستوورێکم بۆ هەرێمی کوردستان ئامادە کرد و دابەش کرا بەسەر زۆربەی قانووناسانی کوردستاندا. لە ماوەیێکی کورتدا کۆمەڵێك ڕا و سەرنجی بەنرخم بە دەست گەیشت، کە بوونە هۆی دەوڵەمەندکردنی پرۆژەکە، پاشان پرۆژەکەم خستەوە بەردەست دەزگایەکی قانوونی بە ناوی "دەستەی قانوونی باڵا"، کە ئەندامی بووم، تا زیاتر لێی بکۆڵێتەوە. پرۆژەکە پاشان بە شێوەیێکی فەرمی خرایە بەردەست پەرلەمان و حکومەت. مەبەست لە گێڕانەوەی ئەم ڕووداوە ئەوەیە، ئامادەکردنی بەڵگەنامەیەکی وەك دەستوور دەبێ بە هاوکاری پسپۆر و شارەزایان ئەنجام بدرێت، خەڵکانی دیکەش بەشداری لە دەوڵەمەندکردنی بکەن، ئەوە ئەرکی هەموو لایەکە. لە بەشێك لە وڵاتانی دونیادا داوا لە چەند قانووناسێك کراوە پرۆژەی

دەستوورێك ئامادە بكەن، بەڵام پاشتر خەڵكانێكی زۆر بەشدارییان لە دەوڵەمەنـدكردنی كردووە و جارێكی دی تەماشا كراوەتەوە.

**پرسیار: بە ڕای تۆ پرۆژەی دەستووری هەرێمی كوردستان لە ئاست هـەموو داوا سیاسییەكانی گەلی كوردستانە؟**

وەڵام: هەموو دەزانین كە داواكارییـەكانی گـەلی كوردسـتان لـە چ ئاسـتێكدان. ئەگـەر بەو ئاستە تەماشای پرۆژەكە بكـەین، وەڵامـان نـەخێر دەبـێ. بـەڵام بـۆ ئـەم قۆناغـەی پێیدا تێدەپەڕین، پرۆژەكە وەك پێشتر ئاماژەم بۆ كردووە، بنـەمای زۆر چاكی تێدایـە، كە یەكێكیان چەسپاندنی مافی چارەنووسە، لەگەڵ مافی داواكردنـی ڕاپرسـی لـە لایـەن ڕێژەیەكی دیـاریكراوی هاوولاتییـانی كوردسـتان سـەبارەت بـە بابـەتێكی دیـاریكراو. بـۆ نموونە، ئەگەر ئەم بارە نالەبارەی ئێـستا عێـراق تێیـدا دەژیـت بـەردەوام بێـت، دەكـرێ خەڵكی هەرێمی كوردستان داوابكەن هەرێمەكەیان بكرێت بە هەرێمێكی كۆنفیدراڵ، تـا بتوانێ ڕاستەوخۆ پەیوەندی بـە دەوڵـەتانی دونیـاوە بكـات. ئـەركی هەموومانـە هـەوڵی دەوڵەمەندكردنی پرۆژەكە بدەین، نـەك مافـەكانی هـەرێم كـەم بكرێنـەوە بـە بیانگـەی ئەوەی چەند ماددەیەكی ناگونجێن لەگەڵ ماددەكانی دەستووری عێراقی.

دەسـتووری هـەرێمی كوردسـتان نـابێ كـۆپی دەسـتووری عێـراق بێـت، ئـەگینا بـۆ دەستوور بۆ هەرێم دادەنێن. كوردسـتان لـە سـەرەتای دامەزرانـدنی دەوڵـەتی عێراقـەوە تایبەتمەنـدیی خـۆی هـەبووە، ویلایـەتی موسـڵ چـەند سـاڵێك پـاش دامەزرانـدنی ئـەو دەوڵەتە خراوەتە پاڵی، ئەویش بە چەند مەرجێك، كە هیچ حكومەتێكی عێراقی ڕێزی لێ نەگرتوون. لە چەند بەڵگەنامەیەكی نێودەوڵەتیدا دان بە مافی چارەنووس بـۆ گـەلی كوردسـتاندا نـراوە، وەك پەیماننامـەی (سـێڤر)ی نێودەوڵـەتی، كـە لـە سـاڵی 1920 مۆركراوە.

**پرسیار: لێرە و لەوێ دەنگی ناڕەزایی هەیە بەوەی وەكو پێویست ئەم پرۆژەیە لە ئاست داوای پێكهاتەكانی كۆمەڵگای كوردستان نەبووە، بۆ نموونە سەركیس ئاغاجان گلەیی كردبوو، ئافرەتان گلەییان هەیـە، گلـەیی ئیـسلامییەكان تـا چـەند بەجێیـە و..هتد، ئەم گلەییانە چۆن هەڵدەسـەنگێنی، كـە لەوانەیـە زۆر گلـەیی و ڕەخنـەی دیكەش بەڕێوەبن، وەكو پرۆژەی دەستوورەكە لە كوێ كورتی هێناوە و لە كوێ سەری كردووە؟**

وەڵام: لە دەستووردا بنەما سەرەکی و گشتییەکان دەنووسرێن، نەك وردەکارییـەکان. لـە پرۆژەکـەدا بـاس لـە چـەند بابـەتێك کـراوە، کـە چاکتر بـوو بـە قـانوونێکی تایبـەت چارەسەر بکرێن، وەك ئەوەی لە ماددەی سـەد و پـەنجا و پێنجدا هـاتووە سـەبارەت بـە زەویوزاری کشتوکاڵی، کـە قـانوونی ژمـارە 117ی سـاڵی 1970 و قـانوونی ژمـارە 90ی سـاڵی 1975 چارەســەری کــردوون. ئــەو کێــشانە دەکــرێ بــە قــانوونێکی تایبــەت بــە زەویـوزاری کـشتوکاڵی چارەسـەر بکـرێن، نـەك لـە دەسـتووردا. ئـەو ماددانـەی بـۆ مـافی نەتەوەکانی کوردستان تەرخان کراون کەم نین، چونکە دەکرێ بە قانوون دەوڵەمەندتر بکرێن. هەمان شت بە نیسبەت مافی خانمان و ئەوانی دیکەوە.

**پرسیار: پێشبینی چ هەڵوێستێك لە بەغدا دەکەن دەرهەق بە پرۆژەی دەستووری کوردستان، پێت وایە لە کوێ پرۆژەی دەستووری کوردستان هاودژ و ناکۆکـە لەگـەڵ دەستووری عێراقی فیدراڵ، بەتایبەت لەسـەر پرنـسیپی (ئیـسلام وەکو سەرچاوەی یاسادانان و فیدراڵیزم و کەرکووك و ناوچە دابڕاوەکان و سەروەت و سامان). پێشبینی ئـەوە دەکـەن پرۆژەکـە لـە لایـەن دادگـای دەسـتوورییەوە لـە بەغـدا تووشـی کێـشە (نادەستوورییەتی دەستووری) ببێت؟**

وەڵام: لەم باوەڕەدام چەند دەوڵەت و لایەن و کەسـانی دیکـەش دژایـەتی دەسـتووری هەرێمی کوردستان دەکەن.

دیاریکردنی سنووری هەرێمی کوردستان، بەو شێوازەی لە ماددەی دوودا هاتووە، زۆر لایەنی ناڕەحەت کردووە.

ڕۆژی پـاش بلاّوکردنــەوەی پرۆژەکـە لـە پەرلـەمانی هـەرێم لـە 24ی ئەیلوولـدا، پەیامنێری BBC پەیوەنـدی پێـوە کـردم و پرسـیاری یەکـەمی ئـەوەبوو چـۆن دەکـرێ کەرکووك و ئەو ناوچانەی دیکە بخرێنە سەر سنووری هـەرێمی کوردسـتان، لـە کاتێکـدا هیچ بڕیارێکی لەسەر نەدراوە و پاشەڕۆژیان جارێ یـەکلایی نەکراونەتـەوە، ئایـا ئەمـە بە پێـچەوانەی دەسـتووری عێـراق نییـە؟ ئـەو پرسـیارە دەلیلـی ئەوەیـە کـە زۆر لایـەن ناڕەحەت بـوون لـەو پرۆژەیـە و لـە ناوەرۆکەکـەی. قسەکانی وەزیـری نـەوتی عێراقـی دەچنە ئەو خانەوە، ئەو جۆرە رەخنانە لـە ئاینـدەدا زۆرتـر و تونـدتر دەبـن. ئێـستاکە بەشی زۆری لایەنە سیاسییەکانی عێراقی خەریکی کێشەی ناوخۆیانن و ناپەرژێنە سەر رەخنــەگرتن لـە نـاوەرۆکی پرۆژەکـە. ئـەرکی داکـۆکیکردن لـە دەسـتووری هـەرێم لـە

ئەستۆی دادگەی دەستووریی هەرێمی کوردستان دەبێ، کە ئەندامەکانی پێویستە کەسانێکی قانونزانی شارەزا بن، تا بتوانن بە شێوەیەکی قانوونیی گونجاو داکۆکی لە ماددەکانی دەستوورەکەمان بکەن. کێشەی تانەدان لە نادەستووریيەتی بەشێك لە ماددەکانی دەستووری هەرێم، ئەمرۆ بێت یان سبەی، لەلایەن حکومەت یان خودی دادگەی بالاّی دەستووری عێراقییەوە بەرەورووومان دەبێتەوە.

**پرسیار: ئەگەر گەلی کوردستان لە ڕاپرسیدا ڕەزامەندیی خۆی لەسەر پرۆژەی دەستوور نیشاندا و پەرلەمان پەسندی کردو سەرۆکایەتیش لە (وەقایعی کوردستان) بلاّوی کردەوە، حکومەتی فیدراڵی لە بەغدا چەند دەتوانێ لە ڕووی یاساییەوە داوای پووچەڵکردنەوە یان دەستکاریکردنی دەستووری کوردستان بکات؟**

وەلاّم: گەلی کوردستان خاوەن دەسەلاّتە و هەر ئەویش دەنگ لەسەر پرۆژەکە دەدات و پەسندی دەکات. تەنیا ڕێگا لەبەردەم حکومەتی بەغدا تانەدانە لە ماددەیەك یان لە چەند ماددەیەك لە دەستووری هەرێمی کوردستان، لەبەردەم دادگەی بالاّی دەستووریی عێراقی.

پێم باشە لێرەدا ئەوە ڕوون بکەمەوە، کە دانیشتوانی ناوچە دابڕاوەکانی کوردستان ناتوانن بەشداری لە پرۆسەی دەنگدان لەسەر پرۆژەکە بکەن، پێویستیش ناکات لەبەر ئەو هۆیە پرۆسەی دەنگدان دوابخرێت تا پاشەڕۆژی ئەو ناوچانە یەکلایی دەکرێتەوە.

ئەو دەمەی کە دانیشتوانانی ئەو ناوچانە دەنگ دەدەن کە ناوچەکانیان ببێتە بەشێك لە هەرێمی کوردستان، ئەو دەنگدانە ئەوە دەبەخشێ دەنگیان بە دەستوورەکەش داوە و ئەو بارە قانوونییەی لەوێدا هەیە قبووڵیان کردووە، لە ڕووی قانوونییەوە پێویست ناکات جارێکی دیکە دەنگ بەو دەستوورە بدەنەوە، یان پێشتر دەنگیان بۆ دابێت. کەواتە پێویست ناکات چاوەڕێی یەکلاییکردنەوەی پاشەڕۆژی ئەو ناوچانە بکرێت، چاکترە لە سەرەتای ساڵی تازەدا دەنگ لەسەر پرۆژەکە بدرێت، هەر کاتێ ئەو ناوچانە گەڕانەوە سەر هەرێم، ئەو دەستوورە ئەوانیش دەگرێتەوە. دەوڵەتی عێراق لە ساڵی 1921 لە هەردوو ویلایەتی بەغدا و بەسرە دروست کراوە، بەلاّم دەستووری عێراق لە ساڵی 1925دا پەسندکراوە، بەلاّم لە ساڵی 1926 ویلایەتی موسڵ بە فەرمی خراوەتە سەر ئەو دەوڵەتە، بێ ئەوەی بەشێکی زۆر لە دانیشتووانانی

ئەو ویلایەتە پێشتر دەنگیان بۆ ئەو دەستوورە دابێ. لە ڕووی قانوونییەوە لەو کاتەوە دەنگیان بۆ چوونە پاڵ ئەو دەوڵەتە داوە، دەنگیان بۆ دەستوورەکەشی داوە.

## دواخستنی تەماشاکردنی پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان و دەنگدان لەسەری بە بڕیاری سەرکردایەتی سیاسی بووە، نەك پەرلەمان[1]

**پرسیار: تاوتوێکردنی پرۆژەی دەستووری هەرێم زۆر لەوادەی خۆی دواکەوتووە، لەجیاتی مناقەشەکردنی یاسای وەزارەتەکان لەلایەن پەرلەمانەوە، دەبا یەکەم جار دەستووری هەرێم تەواو کرابا، ئەوسا لەژێر رۆشنایی ئەو دەستوورە یاسای وەزارەتەکان و کاروبارەکان بەگشتی رێکخرابا، هۆکارەکانی دواکەوتنی دەستوور لە چیدا دەبینییەوە؟**

وەڵام: سەرەتا پێویستە تیشك بخەمە سەر چۆنییەتی ئامادەکردنی پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان، چونکە ئەو پرۆژەیە لە ساڵی 1992 ئامادە کراوە، لەگەڵ پەسندکردنی سیستمی فیدراڵی لە لایەن پەرلەمانی کوردستانەوە. ئەو پرۆژەی لەو ساڵە ئامادەکرا نەخرایە بەردەم پەرلەمان لەبەر چەند هۆیەکی سیاسی. کەسانێك دەیانگوت چۆن دەبێ دەستووری هەرێمی کوردستان پێش دەستووری عیراق بکەوێت؟ بە بۆچوونی ئەوان، دەبوو چاوەڕێی گۆڕانکاریی سیاسی لە عێراق بکرێت، دواتر باس لە داڕشتنی دەستوور بۆ کوردستان بکرێت. قانوونناسی وا هەبوو تا ساڵی 2002 دەیگوت پێویستیمان بە دەستوور نییە، چەند "قانوونێکی دەستووری"مان هەیە جێگای دەستوور دەگرنەوە! وادەزانم پاش پەسندکردنی سیستمی فیدراڵی لە ساڵی 1992 دەبوو خەریکی ئامادەکردنی دەستوور بین بۆ کوردستان، چونکە پەسندکردنی سیستمی فیدراڵی بووە هۆی هەڵوەشاندنەوەی سیستمی حوکمڕانی لە عێراق و کوردستان لەسەر بنەمای (لامەرکەزییەت)، ئەوەش پێویستی بە دانانی دەستوور دەکرد لەسەر بنەمای فیدراڵیزم. لە ساڵی 1925ەوە سیستمی سەنترالیزم (مەرکەزییەت) سیستمی حوکمڕانیکردن بووە لە عێراق، بەڵام پەرلەمانی هەرێمی کوردستان ئەو سیستمەی گۆڕی و فیدراڵیزمی پەسند کرد، هەنگاوی پاشتر دەبوو دانانی دەستوور بێ. بەبۆچوونی من، بڕیاری پەرلەمانی کوردستان بە گۆڕینی سیستمی حوکمڕانیکردن لە سەنترالیزمەوە بۆ فیدراڵیزم، لە دانانی دەستوور گرینگتر بوو، ئەگەر پەرلەمانی کوردستان سیستمی حوکمڕانیکردن لە عێراقدا بگۆڕێ، بۆ دەبێ نەتوانێ دەستوور بۆ

(1) رۆژنامەی (کوردستان راپۆرت)، ژمارە (224)ی رۆژی 11 حوزەیرانی 2007.

کوردستان دابنێ؟ بەڵام باری سیاسی لە کوردستان و عێراق و ناوچەکە ئاڵۆز بوو، لەشکری عێراق چەند کیلۆمەترێ لە هەولێری پایتەختەوە دوور بوو، دەوڵەتانی ناوچەکە بە بەردەوامی کۆدەبوونەوە و هەڕەشەیان لەو قەوارە سیاسییەی تازە دامەزراوە دەکرد کە جارێ سەرپێی نەکەوتبوو. کۆمەڵێك قانوونناس و ڕووناکبیر لە کوردستان و دەرەوەدا، داوای دانانی دەستووریان دەکرد، بە مەبەسی چەسپاندنی ئەو قەوارە سیاسییە (دێ ‌فاکتۆ)یە.

لە مانگی ئەیلوولی 2006دا پرۆژەی دەستوورێکی نوێ ئامادە کرا و بلاْوکرایەوە، تا هەموو لایەن و گرووپ و کەسانی دیکە سەرنج و تێبینیی خۆیان دەربارەی دەربڕن، بەلاْم تا ئێستا ئەو پرۆژەیە نەخراوەتە بەردەم پەرلەمان، تا پاشتر دەنگی لەسەر بدرێ. بڕیاری دواخستنی ئەو پرۆژەیە لە لایەن پەرلەمانەوە نەدراوە، بەڵکو لە لایەن سەرکردایەتی سیاسییەوە، بێ پرسکردن بە پەرلەمان. ئومێدەوارین لەم نزیکانەدا پرۆژەکە پەسند بکرێت، تا لە لایەن دامەزراوە و دەزگاکانی کوردستان پەیڕەوی پێ بکرێت و هاووڵاتییانیش ئاگاداری ماف و ئەرکەکانی خۆیان بن، چونکە لەوێدا دەستنیشان دەکرێن.

**پرسیار: ئەو زمانەی کە پرۆژەکەی پێ نووسراوەتەوە، زیاتر لە زمانی داڕشتن (انشاء)ی قوتابخانەکان دەچێت، لەگەڵ ئەوەشدا لە هەندێ مادده و بڕگەدا موبالەغە و زیادەڕۆیی و درێژدادڕی زۆر تێدا کراوە، ئەمە لەلایەك لە لایەکی ترەوە ئێمە ئەمە یەکەم ئەزموونمانە لە نووسینەوەی دەستوور نە دەکرا سوود لە پسپۆڕانی بیانی وەربگیرێت؟**

وەڵام: پرۆژەکە بە زمانی عەرەبی داڕێژراوە نەك کوردی، لە یەکەم کۆبوونەوەی لیژنەکەمان پێشنیازی نووسینەوەی پرۆژەکەم بە زمانی کوردی کرد، چونکە (کوردی) زمانی فەرمییە، دەبوو ئەو بەڵگەنامە گرینگە بەو زمانە بە ڕوونی دابڕێژرێت، بەڵام پێشنیازەکەم قبووڵ نەکرا. پاش ئامادەکردنی پرۆژەکە، ئەرکی وەرگێڕانیان پێ سپاردم، بە هاوکاری چەند دۆستێکی زمانزان پرۆژەکەمان کردە کوردی و بەچاپکراوی دامە سەرۆکی لیژنەکە. بەڵام لیژنەکە بەبێ ئاگاداریکردنەوەم، داوای لە چەند ئەندامێکی کردبوو بە کوردییەکەدا بچنەوە، ئەوە کارێکی باش بوو، بەڵام دەبوو منیش ئاگادار بکرێمەوە تا هاوکارییان بکەم. ئەو چەند ئەندامە دەستکاریی زۆریان لە پرۆژەکەدا

کردبوو، چونکە بە دەقاودەقی لە عەرەبییەوە کردبوویانــە کوردی، ئــەوەش بــووە هــۆی ئەوەی ڕەخنە لە زمانی داڕشتنی بگیرێ. (پێشەکی)ی پرۆژەکە لـە سـەرەتاوە بەشـداریم نە لە داڕشتنی بە عەرەبی، نە لە وەرگێڕانی بۆ کوردی نەکردووە، سەرۆکی لیژنـەکە بە زمانی عەرەبی ئامادەی کردووە، دواتر ئەنـدامێکی لیژنەکـە وەریگێڕاوەتـە سـەر زمـانی کوردی هەر بە ناوی (دیباجە)وە. بە شێوەی گشتی، منیش ڕەخنەم لە زمـانی داڕشـتنی پرۆژەکە هەیە، (پێشەکی)یەکەی بە زمانێکی ئینشائی داڕێژراوە، چاکتربوو کورتتر و بە زمانێکی قانوونی داڕێژرابێ. بە کوردی (پێشەکی)یێکی کـورتترم بـۆ ئامـادەکردن، بـەڵام تەماشا نەکرا. پاش وەرگێڕانی دەقە عەرەبییەکە بۆ کوردی، پێشنیازم کـردەوە تێکسـتە کوردییەکە بکرێتە تێکستی سەرەکی و بنەما، ئەوەش قبووڵ نەکرا.

لـە سـەرەتاوە لەگـەڵ ئـەو بۆچـوونەدا بـووم کـە چـەند پـسپۆڕێکی بیـانی هاوکـاری لیژنەکەمان بکات. لـە بـەهاری 2006، ئینـستیتوی فەرەنـسی لـە پـاریس، بـە هاوکـاری وەزارەتی ڕۆشنبیریی کوردستان، کۆنفرانسێکی لـە هـەولێر ڕێکخست. لـەو کاتـەدا ئێمـە خـەریکی ئامـادەکردنی پرۆژەکـە بـووین، لـە کۆنفرانـسەکەدا چـاوم بـە قانوونناسـێکی کەنــەدی - فەرەنــسی زمــان کــەوت، کــە مامۆســتای قــانوونی دەســتوورییە لــە زانکــۆی (کێبەك)، داوای لێکرابوو سەردانی پەرلەمان بکات بۆ چاوپێکەوتنی ئەندامانی لیژنــەی دەستووری. ئـەو مامۆسـتا کەنـەدی – فەرەنـسییە هاتـە پەرلـەمان و لەگـەڵ ئەنـدامانی لیژنەکە کۆبووەوە. یەکەم ڕەخنەی ئـەوە بـوو، بـۆ چـاوەڕێی دانـانی دەسـتووری عێـراق کـراوە، بـۆ پێـشتر دەسـتوورتان بـۆ خۆتـان ئامـادە نـەکردووە؟ وتـی ئەگـەر دەسـتووری کوردستان پێش دەستووری عێراق پەسند بکرابـا، تووشـی ئاسـتەنگ نـەدەبوون و ئـازاد دەبوون لە داڕشتنی دەستوورەکەتان بەو شێوەی خۆتـان دەتانـەوێ. ئـەوەش داواکـاریی من بووە لە سـاڵی 1992ەوە، لـەو دەمـەوە لـە چـەندەها نووسـین و کۆبوونـەوەدا داوای پەلەکردنم لە داڕشتنی دەستوور بۆ کوردستان کردووە. ئەندامانی لیژنەکە کە قسەکانی ئـەو مامۆسـتا کەنەدییـەیان بیـست، تەماشـایان دەکـردم، چـونکە بەشـی زۆریـان لەگـەڵ دواخستنی دەستووری کوردستان بوون، تا ئەو دەمەی دەستووری عێراق دادەنـرێ! کـات بەسەرچــوون لــە بەرژەوەنــدی کــورد نــەبووە، ئەگــەر دەســتووری کوردســتان پــێش دەستووری عێراق پەسند بکرابا، ئەمڕۆکە نەدەبەسترایەنەوە بە بەشی زۆری بەنـدەکانی دەستووری عێراق.

**پرسیار: هاوڵاتییان و رۆشنبیران، ئەوانەی کە پرۆژەکەیان دیوە، لەگەڵ هەموو پارتە کوردییەکانی کوردستان زۆر سەرنج و تێبینییان لەسەر رەشنووسی دەستوورەکە هەیە، تا چەند ئەم رەخنە و سەرنجانە لەلایەن لێژنەی پێداچوونەوەی رەشنووسەکە وەرگیراون و کاریان لەسەرکراوە، یان بە واتایەکی تر پەرلەمان هیچ دەسەڵاتی هەیە لە هەموارکردن و دەستکاریکردنی ماددەو بڕگەکان، یان حکومەت و هەردوو حزبەکە لە سەروو پەرلەمانەوەن، و ئەوان پەرلەمان ئاراستە دەکەن؟**

وەڵام: پرۆژەکە لە ئەیلوولی 2006 بڵاوکرایەوە، لەو دەمەوە چەندین لایەن و کەسی شارەزا ڕا و سەرنج و پێشنیازی خۆیان بۆ لیژنەکە ناردووە، بە مەبەستی دەوڵەمەندکردنی. من خۆشم یەکێك بووم لەو کەسانەی لێکۆڵینەوەیەکی (41) لاپەڕەییم لەسەر بلاوکردووەتەوە و ڕادەستی لیژنەکەم کرد.

ئەوەی ئاگادار بم، تا ئێستا لیژنەکە کۆنەبووەتەوە بۆ تەماشاکردنی ئەو تێبینییانە، بەڵام چەند ئەندامێکی خەریکی کۆکردنەوەی پێشنیازەکانن، تا لە ئایندەدا بخرێنە بەردەم لیژنەکە و بڕیاریان لەسەر بدرێ. بێگومان لیژنەکە دەبێ تەماشای هەموویان بکات، دواتر دەستکاری پرۆژەکە بکات، بۆ چاککردنی کەموکورتییەکانی، پێش ئەوەی بخرێتە دەنگدانەوە.

**پرسیار: دەڵێن لە ڕۆژهەڵاتی ناوین بە گشتی، بە هەرێمی خۆشمانەوە دەستووری وڵات، مەرەکەبی وشکەوەبووی سەرکاغەزە و بۆ حکومەت و لایەنی جێبەجێکار ئیعتباری نییە، بەو مانایەی کە لە وڵاتی ئێمەدا یاسا سەروەر نییە و میزاجی تاکەکەسی فەرمانڕەوایە، بە واتایەکی تر دەستوور نابێ لە سەرەوەی کۆمەڵ و کۆمەڵگەوەبێ، بۆ ئەوەی بە یەکسانی جێبەجێ بکرێت پێویستە مرۆڤ سەروەر بێت؟**

وەڵام: جیاوازی لە نێو وڵاتانی (شمولی) و دیموکراسی ئەوەیە، قانوون لە وڵاتانی دیموکراسیدا سەروەرە و کەسێك ناتوانێ خۆی لەسەرووی قانوون دابنێ و ڕێزی لێ نەگرێ. لە بەشی زۆری ئەو وڵاتانەدا، دەستوور ڕێگای تانەدان لە حکومەت و دەسەڵات دیاری دەکات، هاووڵاتییان دەتوانن ئەگەر بەندێکی دەستوور پێشێل بکرێ، داوا لە دادگەی دەستووری بکەن ئەو بڕیارە نادەستوورییە هەڵوەشێنێتەوە. لەو وڵاتانەدا دادگەیەك بە ناوی (دادگەی دەستووری) هەیە، ئەرکی سەرەکی تەماشاکردنی داوا و تانەی هاووڵاتییانە، ئەگەر دەسەڵاتێك لە دەسەڵاتەکان بەندێکی دەستوور پێشێل بکات.

ئەو دادگەیە دەتوانێ بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی ئەو بڕیارە بدات، ئایا بڕیارێکی ئیداری بێ، یان پێوەندی بە دەستوور و قانوونەوە هەبێ. لە دەستووری تازەی عێراقدا دادگەیەك بەو ناوەوە دامەزراوە، لە پرۆژەی دەستووری کوردستانیشدا پێشنیازی دامەزراندنی ئەو دادگەیە کراوە، بەڵام پێویستە ئەو کەسانەی دەبنە ئەندام لەو دادگەیە کەسانی شارەزاو پسپۆر بن و بێ لایەنیش بن، نەك بە (تەوافوق) دەستنیشان بکرێن لەنێو لایەنە سیاسییەکاندا !

**پرسیار: لە پرۆژەی دەستووری هەرێم کە لە ساڵی (2002)دا ئامادە کراوە شاری کەرکووك کراوە بە پایتەختی کوردستان، بەڵام دوای (2003) کە دووبارە دەستکاری پرۆژەکە کرایەوە شاری هەولێر کراوەتە پایتەخت و ناوی کەرکووك ڕەش کراوەتەوە، ئەمە مانای ئەوەیە بە ڕاستی ئێمە کەرکووکمان لەکیس چووە، ئەم گۆڕانکارییە بۆ؟**

وەڵام: لە پرۆژەی دەستووری ساڵی 1992دا، هەولێر کرابووە پایتەختی هەرێمی کوردستان. لە ڕووی جوگرافیاوە کەوتووەتە ناوەڕاست باشووری کوردستان و بەشی هەرە زۆری دامەزراوە و دەزگاکانی کوردستان لەوێدان. لە پرۆژەی نۆڤەمبەری 2002دا، پێشنیازی شاری کەرکووك کرابوو بکرێت بە پایتەخت، بڕوا ناکەم کەسێك بە قەد من ئەو پێشنیازەی پێ خۆش بێ، بەڵام دەستنیشانکردنی کەرکووك لە پرۆژەی ساڵی 2002دا بۆ مەبەستێکی سیاسی بوو. ئەوا چوار ساڵ زیاترە کەرکووك بەناو ئازادکراوە و ماددەی 140ی دەستوور تەرخان کراوە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی، بەڵام چی بۆ کراوە؟ کام بەندی ئەو ماددە دەستوورییە جێبەجێ کراوە؟ ئێمە رازین بەوەی کەرکووك بگەڕێتەوە سەر هەرێمی کوردستان وەك شارێك، نەك وەك پایتەختی هەرێم. نەیارانی کورد بە هەموو شێوەیەك هەوڵی ئەوە دەدەن نەو ماددە دەستوورییە جێبەجێ نەکرێ. پێشنیازی پرۆژەی ساڵی 2002 کێشەی بۆ کەرکووك دروست کرد، هۆیەکەشی سیاسەت و عاتیفە بوو.

**پرسیار: ئەگەر ئەم دەستوورە پەسند بکرێ لەلایەن پارتە سیاسییەکان و جەماوەرەوە، کۆمەڵگەی کوردی بەرەو چ ئاقارێك دەبات، مەبەستم ئاقاری دیموکراسی، مەدەنی، یان پاوانخوازی و عەسکەرتاریەتە چونکە زۆرینەی پەرلەمان سەربە دوو حیزبی دەسەڵاتدارن و بێگومان نووسینەوەی دەستووریش کاریگەریی ئایدیا و ویستی ئەوانی بەسەرەوە دەبێت؟**

وەلاٚم: لە ناو کۆمەڵگای ئێمەدا فەرهەنگی دیموکراسی بلاٚو نەبووەتەوە، بەشی زۆری حیزبــە سیاســییەکان خــەریکی بلاٚوکردنــەوەی فەرهــەنگی حیزبایــەتین، مەترســیش لەوەدایــە ئــەو جــۆرە فەرهەنگــە لــەناو کۆمەڵگاکــەمان جێگیربــێ. لــە ڕاپــۆرتی ساڵانەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا سەبارەت بە ڕەوشی مـافی مـرۆڤ لـە جیهـان، کـە دوو مـانگ لەمەوبەر بلاٚوکراوەتەوە، ئاماژەی تێدا کـراوە بـۆ دیـاردەی پـەیڕەوکردنی حیزبایـەتیی تەسك لە باشووری کوردسـتان و بـاس لـە حیزبایـەتی پـێش لێهـاتوویی کـراوە لـە کـاتی ناولێنانی فەرمانبەران. جێگای داخـە ئێـستاش داوای "تەزکیـەی"حیزبـی لـەو کەسـانە دەکـرێ، کـە دەیانــەوێ لــە دەزگاکــان دابمــەزرێن، ئــەو چــەند وەزارەتــە کــە تــا ئێــستا یەکنەخراونەتەوە، لەبەر حیزبایەتی بووە. هەڵبەتە لە کەش و هەوایەکی وادا ناتوانین باس لە دامەزراندن و چەسـپاندنی دامـەزراوەی دەسـتووری و قـانوونی بکـەین و بڵـێین کۆمەڵگاکەمان بـەرەو کۆمەڵگایـەکی مـەدەنی هـەنگاو دەنـێ. ئێمـە دەزانـین حیزبایـەتی کۆڵەگەی دیموکراسییەتە، لـە وڵاتێکـدا ژیـانی حیزبایـەتیی نـەبێ، وڵاتێکـی دیموکراسـی نییە، بەلاٚم ئەوەی لە کوردستان پـەیڕەو دەکـرێ حیزبایـەتیی تەسـکە. یـەکێ لـە هۆیـە سـەرەکییەکانی جێبـەجێ نـەکردنی مـاددەی 140 لـە کـەرکووك و ناوچـە دابڕاوەکـانی دیکەی کوردستان، پـەیڕەوکردنی حیزبایـەتی تەسـکە لـەو ناوچـانە، هەرچـەندە دەڵـێن کوردایەتی دەکەن. حیزبایەتی دەبێ لە خزمەتی کوردایەتیدا بێ، نەك بە پێچەوانەوە. وەك پەرلەمانتارێکی سەربەخۆ و بێ لایەن، موعاناتم لە ناو ئەو دامـەزراوە لـە هـەموو کەسـێك زیـاترە. لـە کۆبوونـەوەی ڕۆژی 4 حـوزەیرانی 2007ی پەرلـەمان ڕووم کـردە سـەرۆکی پەرلـەمان و وتم وادیـارە کەسـی بـێ لایـەن لـەناو پەرلـەمان و لـە دەرەوەدا کەسێکی بێ پشت و پەنایـە! عەقڵیـەتی "خـۆ ساغکردنەوە" ئێـستاش هـەر بـاوە لـەناو حیزبە دەسەلاٚتدارەکانی کوردستان، ئێستاش بەشێك لە سیاسەتمەداران وا بیر دەکەنەوە کە دەبێ هەموو کەسێك لەگەڵ لایـەنێکی سیاسـی بـێ و کەسـی بـێ لایـەن نییـە، بۆیـە هەندێك دەڵێن لە ناو پەرلەمانیشدا بێ لایەن نییە، من دەڵێم هەیە، بەلاٚم یەك کەسـە! بە داخەوە ئێستاش لە ناو پەرلەمان و دامەزراوە و دەزگاکانی دیکەی کوردستان پێوەری "دڵسۆزی"حیزبایەتییە، نەك شارەزایی و لێزانی، ئەگەر ئەم بۆچوونە بەو شێوە بمێنێ و پێڕەوی پێ بکرێ، پاشەڕۆژی وڵاتەکەمان بەرەو دواکەوتن و ئاقارێکی ترسناك دەڕوا. جێگای داخە گەر بڵێم حیزبـەکان بـە گشتی تەماشـای ڕابـوردووی کـەس ناکـەن، کـاتێ

یەکێ لە دەرگایان دەدا، کەسانێکی زۆری کۆنە بەعسی و کۆنە موخابەراتی و کەسانی سەر بە دەزگاکانی ئەمن جێگای خۆیان لەناو حیزب و دەزگاکان کردووەتەوە، بۆیە ڕەشەکەی جارانیان بە بۆیەی حیزبێك داپۆشیوە، هەرچەندە دیارە و ناشاردرێتەوە!. من دژی بڕیاری لێبووردنی گشتی نەبووم، کە لە ساڵی 1991دا لە لایەن سەرکردایەتی سیاسیی بەرەی کوردستانییەوە دەرچوو، بەلام ئەوە نەدەبوو ببێتە هۆی ئەوە بەشێکی زۆریان بکرێنەوە بە بەرپرس و "واجیهەی"ئەو حیزبانە. بەشێك لەو کەسانە تا ئێستاش ڕۆڵێکی خراپ دەبینن لە خراپکردنی پەیوەندیی نێوان حیزبەکان، تا بیسەلمێنن "لە شا شاپەرستترن"! پێش ڕووخانی رژێم تەنیا لە پرسە و تازیەدا چاومان بەو کەسانە دەکەوت، هەتا لەو جێگایانەش پێمان خۆش نەبوو وەلامی بەخێرهاتنیان بدەینەوە! ئێستا بەشێ لەوانە لە ناو حیزبەکاندا جێگای خۆیان کردووەتەوە و بە تەوسەوە دەڵێن چیتان بەچی کرد؟! بەلام دڵنیامە لەوەی ئێستاش زۆربەی خەڵك هەر بە چاوی جارانەوە تەماشای ئەو کەسانە دەکەن، هەتا ئەگەر دەسەلاتدار یان واجیهەی یەکێ لەو حیزبانە بن.

**پرسیار: جەنابت کە زۆر رەخنەت لەو رەشنووسە گرتووە و زۆر وتارت لەسەری نووسیوە و لێدوانی رۆژنامەوانی زۆر دەدەیت، پەرلەمان و دەسەلاتی سیاسی و حیزبی تا چەند گوێت لێ دەگرن و ڕاکانت وەردەگرن؟**

وەلام: ئەرکی ئێمە ئەوەیە ئەوەی بە راستی دەزانین بۆ پێشخستنی کێشە ڕەواکانی گەلەکەمان، بۆ بەرەوپێشبردن و چەسپاندنی کۆمەڵگایەکی مەدەنی کوردستانیی راست و دروست، بینووسین و بلاوی بکەینەوە. لەو باوەڕەدام بەشی زۆری کەسانی ناو حیزب و دەرەوەی حیزبەکانیش ئەوە دەزانن، کە بەو گیانەوە قسە دەکەم یان بابەتێك دەنووسم. ئەو هەڵوێستەم پێشتر سەرئێشەی زۆری بۆ دروست کردووم، بۆ خۆم و بۆ خێزانەکەم. سامی عەبداڵی شاعیر دەڵێ، من نەسووتێم تۆ نەسووتێی، چۆن هەژارم پێ دەگات! ئەو رەخنانەی ئاڕاستەی شێوەی داڕشتنی پرۆژەی دەستوورم کردووە لەگەڵ بەشێك لە ماددەکانی، بە مەبەستی چاککردنی کەموکوڕیەکان و دەوڵەمەندکردنیەتی، بۆ ئەوەی دەستوورێکی هاوچەرخ و گونجاو بۆ ئەم بەشە رزگارکراوەی کوردستان ئامادە بکرێت. دەستوور بەڵگەنامەیەکی قانوونیی زۆر گرینگە، پێویستە بە زمانێکی ڕەوان بنووسرێتەوە. هۆی سووربوونم لەسەر بەکارهێنانی زمانی کوردی لە پەرلەمان و لە ناو

دەزگاکانی حکومەتیدا، هەر ئەوەیە کاتی ئەوە هاتووە زمانی کوردی بەکاربێت لە ناو هەموو ئەو دەزگایانە، ئەگەر کەموکورتی لە زمانی قانوونی کوردی هەیە، دەتوانین چاکیان بکەین. لە سەردەمی ئێمەدا زمانی کوردی لە کەرکووك زمانی خوێندن نەبوو، بەلاَم بە هاوکاری براکانم فێری نووسین و خوێندنەوەی زمانی کوردی بووم، لە ئاکامدا فەرهەنگێکی قانوونی بە کوردی و چەند زمانێکی دیکەم ئامادە کرد.

**پرسیار: دەستوورەکە کەی مناقەشە دەکرێت لە پەرلەمان و کەی دەخرێتە راپرسییەوە، دوا وتە و سەرنجت لەسەر دەستنووسی دەستوورەکە چییە؟**

وەلاَم: پێشتر وەلاَمی ئەم پرسیارەم داوەتەوە، دیاریکردنی وادەی راپرسی و دەنگدان لەسەر پرۆژەی دەستوور، پاش ئامادەکردنی بە دوا شێوەی، بە دەستی سەرکردایەتی سیاسییە. کۆمەڵێك سەرنجم لەسەر پرۆژەکە لە رۆژنامەکانی کوردستان بلاَوکردووەتەوە و لە میدیادا قسەم لەسەر کردووە، ئومێدەوارم لیژنەکە تەماشایان بکات. لە ژیاندا شانازی بە چەند کارێك دەکەم، کە خۆشبەختانە ئەنجامدراون:

یەکەم: نووسینی لێکۆڵینەوەیێکی قانوونی بوو لە ساڵی 1974 لە لەندەن، لەژێر ناوی (حول مفهوم النظام الفيدرالي)، کە پاشتر چەند جارێك بە عەرەبی و کوردی بلاَوکراوەتەوە. ئەو لێکۆڵینەوە بووە بنەما بۆ ئەو لێکۆڵینەوانەی پاشتر لە کوردستان لەسەر فیدراڵیزم بلاَوکرانەوە.

دووەم: ئامادەکردنی پرۆژەی دەستوورێك بۆ هەرێمی کوردستان لە ساڵی 1992دا، کە یەکەم پرۆژە بوو، لە چاپخانەی (زانکۆ) لە هەولێر بە زمانی عەرەبی چاپ کرا و بەسەر هەموو لایەنە سیاسییەکان و ئەندامانی پەرلەمان دابەش کرا.

سێیەم: نووسینەکانم دەربارەی سیاسەتی بە عەرەبکردنی ناوچەی کەرکووك، ئەو نووسینانەم بە زمانی عەرەبی و کوردی و ئینگلیزی، تا رادەیێکی زۆر سیاسەتی رژێمی بەعسی لە دەرەوە ریسوا کرد.

چوارەم: ئەو فەرهەنگە قانوونییەی کە ساڵانێکی زۆر خەریکی ئامادەکردنی بووم، بە چوار زمانی عەرەبی و کوردی و فەرەنسی و ئینگلیزی، بە هاوکاری مامۆستای گەورە تۆفیق وەهبی بەگ، تا ئێستا چەند جارێك چاپ کراوەتەوە[1].

(1) چاپی شەشەمی ئەم فەرهەنگە لە ساڵی 2013 دەرچووە.

# چەند تێبینییەك لەبارەی پرۆژەی دەستووری هەرێم، كە لە 22ی حوزەیرانی 2009 پەسند كرا[1]

پاش تێپەڕبوونی نزیكەی (3) ساڵ لەسەر بلاّوكردنەوەی ئەو پرۆژە دەستوورەی بۆ هەرێمی كوردستان لە 22ی ئابی 2006 ئامادە كرابوو، لیژنەی پێداچوونەوە بەو پرۆژەیە، پرۆژەیەكی دیكەی لە 22ی حوزەیرانی 2009دا دابەش كرد بەسەر ئەندامانی پەرلەمانی كوردستان. هەر لەو ڕۆژەدا سەرۆكایەتی پەرلەمان پرۆژە قانوونێكی بۆ هەمواركردنی قانوونی ژمارە (16)ی ساڵی 2008، كە تایبەتە بە پەسندكردنی پرۆژەی دەستووری هەرێمی كوردستان خستە ئەجینداى كارەكانی پەرلەمانەوە و خوێندنەوەی یەكەمی بۆ كرا، پاش سەعاتێك ئەو پرۆژە قانوونە لەلایەن پەرلەمانەوە گفتوگۆی لەسەركرا و بە زۆرینەی دەنگ پەسند كرا!

سەرۆكایەتی پەرلەمان بڕیاری داوە ئەو پرۆژە دەستوورەی لە 22ی حوزەیرانی 2009دا بلاّوكرایەوە لەلایەن پەرلەمانەوە پەسند بكرێت، تا لە رۆژی 25ی تەمموزی 2009 بخرێتە ڕاپرسییەوە لەگەڵ هەڵبژاردنی پەرلەمان و سەرۆكی هەرێمی كوردستان. لێرەدا خوێندنەوەیەكی قانوونی بە پەلە بۆ ئەو پرۆژەیە دەكەم، بەدەستنیشانكردنی ئەو دەستكارییانەی لەسەر پرۆژەی دەستووری 22ی ئابی 2006 كراون. بڕیارە پەرلەمانی كوردستان لە 24ی حوزەیرانی 2009 دەنگ لەسەر ئەو پرۆژەیە بدات، دەنگدانیش بە "ئا" یان بە "نا" دەبێت، چونكە پەرلەمان مافی ئەوەی نییە دەستكاری لە پرۆژەكەدا بكات.

تێبینیی یەكەمم لەسەر پرۆژەی 22ی حوزەیرانی 2009 ئەوەیە وشەی (دیباجە) كراوە بە (پێشەكی)و تۆزێك كورت كراوەتەوە، بەلاّم وەك (دیباجەی) دەستووری عێراقی ساڵی 2005 نووسینێكی ئینشائییە و ئاماژەی تێدا نەكراوە بۆ ئەو بەڵگەنامە نێودەوڵەتییانەی دانیان بە مافی چارەنووس بۆ گەلی كورد ناوە، بەتایبەتی پەیماننامەی سێڤەری ساڵی 1920.

---

(1) لە 2009-6-23 لە میدیاكان بلاّوكراوەتەوە.

ماددەی دووەمی پرۆژەکە تەرخان کراوە بۆ دیاریکردنی قەوارەی هەرێمی کوردستان. لە بڕگەی یەکەمی ئەو ماددەیەدا سنووری جوگرافیای هەرێم دیاری کراوە بە دەستنیشانکردنی ناوی پارێزگا و قەزا و ناحییەکان، بەڵام لە بڕگەی دووەمدا باس لە سنووری سیاسیی هەرێم کراوە بە پشتبەستن "بە جێبەجێکردنی ماددەی 140ی دەستووری عێراق". ئەم دوو بڕگەیە بە پێچەوانەی یەکترن و بڕگەی دووەم تەقییدی بڕگەی یەکەم دەکات، وەك پرنسیپێکی قانوونی دەڵێ، (الخاص یقید العام). ماددەی 140 بۆ نەهێشتنی ئاسەواری سیاسەتی بە عەرەبکردن داڕێژراوە، بەپێی ئەو میکانیزمەی لەو ماددەدا دیاری کراوە، تا ئێستاش نازانین چۆن و کەی و بە چ شێوازێك جێبەجێ دەکرێت. ئەم بڕگەیە دەبێتە هۆی کێشە و دروستکردنی پاڵەپەستۆی سیاسی بۆ سەر دەسەڵاتی کوردی لە لایەن حکومەتی عێراق و لایەنە سیاسییەکانی عێراقی و دەوڵەتانی ناوچەکە و دەوڵەتە زلهێزەکان، ئەوەش لە بەرژەوەندیی دواڕۆژی ئەو ناوچانە نییە، کە ماددەی 140 بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان داڕێژراوە. ئەو بڕگەیە پێویستە وەك پێشتر چەندین جار داوامانکردووە، لابرێت و لەناو پرۆژەکەدا نەمێنێ.

بڕگەی یەکەمی ماددەی (6)ی پرۆژەی حوزەیرانی 2009 بڕگەیێکی تازەیە، لە پرۆژەی ئابی 2006دا نەبوو، بەپێی ئەو بڕگەیە هیچ قانوونێك دانانرێت ئەگەر ناکۆك بێت لەگەڵ حوکمە نەگۆڕەکانی ئیسلام، ئەم بڕگەیە لەسەر داوای حیزبە سیاسییە ئیسلامییەکان خراوەتە سەر پرۆژەکە. دەستکارییێکی دیکەش لە ماددەی (8)ی پرۆژەی ئابی 2006دا کراوە، ئەو ماددەیە باسی لە بەکارهێنانی مافی چارەنووسی دەکرد لەگەڵ دیاریکردنی چەند حاڵەتێکی تایبەتدا. لە ماددەی (7)ی پرۆژەی 2009دا ئەو حاڵەتانە ئاماژەیان بۆ نەکراوە، ئەوەش چوارچێوەی بەکارهێنانی ئەو مافە ڕەوایەی کورد کەم دەکاتەوە. لە ماددەی (51)دا ناوی سکرتێری پەرلەمان کراوە بە "سکرتێری گشتی"، هۆکاری ئەو دەستکارییە ڕوون نییە. لە ماددەی (64)دا ماوەی ویلایەتی سەرۆکی هەرێمی کوردستان بە چوار ساڵ دیاری کراوە، بەڵام دەشێ بۆ ویلایەتێکی دووەم هەڵبژێررێتەوە. ڕستەیەکی تازە خراوەتە سەر ئەو ماددەیە لە پرۆژەی 2009دا، بەوەی لە ڕۆژی کارپێکردن بە دەستووری پەسند کراوەوە کاری پێدەکرێت، بۆیە سەرۆکی ئێستای هەرێم دەتوانێ بۆ دوو جاری تر خۆی کاندید بکاتەوە، چونکە ویلایەتی ئێستای بۆ حسێب نەکراوە. لە پرۆژەی ئابی 2006دا ئەو ماددەیە بە موتلەقی بۆ دووجار دیاری کرابوو.

جیاوازییێکی دیکە لە نێو پرۆژەی دەستووری 2006 و ئەوەی ساڵی 2009 ئەوەیە، بەپێی پرۆژەی 2006 سەرۆکی دادگای دەستووری سەرۆکی (ئەنجومەنی دادوەری) بوو، بەلاّم بەپێی ماددەی (98)ی پرۆژەی ساڵی 2009 سەرۆکی دادگای پێداچوونەوە (تەمییز) دەبێتە سەرۆکی ئەو ئەنجومەنە. لە دەستووری عێراقدا سەرۆکی دادگای بالاّ سەرۆکایەتی ئەنجومەنی دادوەری دەکات. ئەگەر ئەم ئەرکە بەسەرۆکی دادگای دەستووری نەدرێت، ئەرکەکانی کەم دەبنەوە، چاکترە لەم حاڵەتەدا ئەندامانی ئەو دادگایە کەم بکرێتەوە، لە (7) ئەندامەوە بۆ (5) بە سەرۆکەکەیەوە.

جێگای داخە پەرلەمانی کوردستان ناتوانێ بەشداری لە چاککردنی ئەو کەموکورییانەدا بکات، کە ئاماژەمان بۆ بەشێکیان کردووە. کەسانێك دەڵێن هەموو دەستوورەکانی دونیا بەو شێوەیە پەسندکراون، پەرلەمان بەشداری لە تاوتوێکردنی هیچ پرۆژە دەستوورێکی نەکردووە. ئەو بەڕێزانە ئاگاداری ئەوە نین، کە دەستووری عێراقی ساڵی 1925 لەلایەن پەرلەمانی عێراقەوە پەسند کراوە، بەلاّم پاش گفتوگۆیەکی چڕوپڕ بەشێکی زۆر لە ماددەکانی دەستکاری کراون یان لابراون.

هۆکاری پەلەکردن لە پەسندکردنی پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان سیاسییە نەك قانوونی، چونکە 17 ساڵە هەرێمی کوردستان بەبێ دەستوور حوکم دەکرێت. لەو ماوە درێژەدا بە بەردەوامی داوای پەلەکردنمان لە پەسندکردنی دەستوور کردووە. لە مانگی تەممووزی ساڵی 1992دا پرۆژەییێکم ئامادەکرد بەهاوکاری بەشێکی زۆر لە قانووناسانی کوردستان، پاشتر ئەو پرۆژەیە خرایە بەردەم پەرلەمان و حکومەتی ئەو دەمەی کوردستان، بەلاّم پەرلەمان تەماشای نەکرد لەبەر هۆکاری سیاسی. بەشێك لەوانەی ئەمڕۆکە داوای پەلەکردن لە پەسندکردنی پرۆژەی دەستووری هەرێم دەکەن ئەو دەمە دەیانگوت پێویستمان بە دەستوور نییە، یان دەیانگوت دەبێ چاوەڕێی دەستووری عێراق بکەین. لە مانگی تەممووزی 2005دا (59) پەرلەمانتار، لە هەموو گرووپەکانی ناو پەرلەمانی کوردستان داوایەکمان خستە بەردەم سەرۆکایەتی پەرلەمان، بەمەبەستی تاوتوێکردنی ئەو پرۆژە دەستوورەی لە مانگی دیسەمبەری 2003دا ئامادە کرابوو، بەلاّم داواکەمان نەخرایە بەردەم پەرلەمان، تا دەستووری عێراق پەسندکرا.

# چەند پرسیارێكی گۆڤاری ( شەقام ) لەبارەی پرۆژەی دەستووری هەرێم

**شەقام: بیرۆكەی ئامادەكردنی پڕۆژەی دەستووری هەرێمی كوردستان چۆن لای ئێوە گەڵاڵە بوو؟**

د. نووری: پاش كشانەوەی دامودەزگاكانی بەعس لە ناوچەی "ئۆتۆنۆمی"و ڕاگەیاندنی فیدراڵی وەك سیستەمی حوكمڕانی بۆ عێراق لە مانگی ئۆكتۆبەری 1992 لەلایەن پەرلەمانی كوردستانەوە، هەنگاوێكی دووەم دەبوو پەسندكردنی دەستوور بێت بۆ هەرێمی كوردستان. دەستوور شێوازی حوكمڕانیی وڵات و ماف و ئەركەكانی هاووڵاتییان دیاری دەكات، لەگەڵ دەسەڵاتی دامەزراوە سەرەكییەكان، وەك پەرلەمان و حكومەت و دەسەڵاتی دادوەری. وەك قانوونناسێك، هەمیشە هەوڵمداوە قەوارەیەكی قانوونی لەو بەشە رزگاركراوەی كوردستان دابمەزرێت و حوكمی دەستوور و قانوون سەروەربێت، دوور لە دەستتێوەردانی لایەنە سیاسییەكان. بۆ ئەو مەبەستە لە ساڵی 1992 پڕۆژەی دەستوورێكم بۆ هەرێمی كوردستان ئامادە كرد، دواتر دابەش كرا بەسەر بەشێكی زۆر لە قانوونناسانی كوردستان، تا ڕا و سەرنجی خۆیان دەربڕن و پرۆژەكە دەوڵەمەندتر بكرێت. لە مانگی تەمموزی 1992 بە بڕیاری پەرلەمان (دەستەیەكی قانوونی باڵا) لە 3 ئەندام دروستكرا، ئەو پڕۆژەكەم بەدوا شێوەی خستە بەردەمی، ئەویش جارێكی تر پێیدا چووەوە.

دەستەكە پاشتر بە نووسراوێكی فەرمی ڕەوانەی سەرۆكایەتی پەرلەمان و حكومەتی هەرێم و هەردوو حیزبی سەرەكی كرد. لەبەر ئەو بارودۆخە سیاسییەی كوردستان پێیدا تێدەپەڕی، پرۆژەكە نەخرایە بەردەم پەرلەمان، هەرچەندە 33 پەرلەمانتار لە هەردوو فراكسیۆنە سەرەكییەكە داوایان لە سەرۆكایەتی پەرلەمان كردبوو پڕۆژەكە گفتوگۆی لەسەر بكرێتو پاشان پەسند بكرێت.

**شەقام: ئەو پرۆژە دەستوورییە كە جەنابت لەساڵی 1992 پێشكەشتكرد چی بەسەر هات؟**

د. نووری: پرۆژەكە لەلایەن پەرلەمانەوە گفتوگۆی لەسەر نەكرا، لەگەڵ ئەوەی ئێمە و خەڵكێكی زۆر لە ناوەوە و لە دەرەوەی كوردستان بە بەردەوامی داوامان دەكرد

ئـەو پرۆژەیـە بخرێتـە بـەردەم پەرلـەمان، بـەلاَم لـەناو دۆلاَبێکـی پەرلـەمان مایـەوە. دەسـتپێکردنی شـەڕی نـاوخۆ و بـەردەوامبوونی بـۆ چـەند سـالَێك، بـووە هـۆی تەماشـا نـەکردنی بـە یـەکجارەکی. لـە کۆنفرانـسێکی زانـستیی نێودەولَـەتی، کـە لـە زانکـۆی (پرنستن)ی ئەمریکی لە ئەیلولی 2004دا بەسترابوو، بابەتێکم دەربـارەی ئـەو پرۆژەیـە پێـشکەشکرد و گفتوگۆیـــەکی تێروتەســـەلی لەســـەرکرا. پـــسپۆرە ئەمریکاییـــەکان پرۆژەکەیان پێ باش بوو، چەند پێشنیازێکیان پێشکەشکرد بۆ دەولَەمەندکردنی، بـەلاَم بەشی زۆری ئەو عێراقیانەی سەر بە لایەنەکانی ئۆپۆزسیۆن بـوون نارەحـەت بـوون لـە بابەتەکە. لە بریتانیا پرۆژەکە کرایە ئینگلیزی و دابەش کـرا بەسـەر چـەند زانکۆیـەك لە ئەوروپا و ئەمریکا، چەند بابەتێك لەسەر پرۆژەکە لە سایتەکان بلاَوکرایەوە.

لـە نیـسانی 2002دا سـەردانی کوردسـتانم کـرد بـۆ بەشـداریکردن لـە کۆنفرانـسێکی تایبەت بە ئەنفال. پێش بەستنی کۆنفرانسەکە دیداری جەنابی کاك مەسعود بارزانیم کـرد، ئاگـاداری کـردم پـرۆژەی دەسـتوورێکیان ئامـادەکراوە لەسـەر بنـەمای پرۆژەکـەی 1992، دانەیەك لەو پرۆژەی پێدام و داوای لێ کردم تێبینییەکانمی لەسەر دەربڕم و بە نووسین بۆی بنێرم. لەو ماوەی لە کوردستان بووم ڕا و سەرنجەکانم بـە نووسـراوی بـۆ نارد، لەگەلَ نامەیەکدا تێیدا ئامادەکاریی خۆم دەربڕیبوو بۆ هاوکاریکردنی ئەو لیژنەی پرۆژەکـەی ئامـادە کردبـوو. لـە مـانگی نۆڤەمبـەری سـالَی 2002دا ئـەو پرۆژەیـە بلاَوکرایەوە، بەلاَم کەموکوڕی زۆری تێدابوو، تێبینییـەکانم لـە هەفتەنامـەی (الاتحـاد) بلاَوکردەوە. ئەو پرۆژەیە لەبەر ئـەوەی پەرلـەمانی کوردسـتان دەنگی لەسـەر نـەدابوو، ئـەوەش لـە ڕووی قانوونییـەوە کـارێکی سـەیر بـوو، چونکە هـەر پرۆژەقانوونێـك گـەر بخرێتـە بـەردەم پەرلـەمان دەبـێ بڕیـاری لەسـەربدرێت وەك قـانوون یـان بڕیـار، ئـەو پرۆژەیە وەك خۆی مایەوە و هیچ سیفەتێکی قانوونی وەرنەگرت.

**شەقام: لە نووسینەکانت باس لە پرۆژە دەسـتوورێکی دیکـە دەکـەیت لـە مـانگی دیسەمبەری 2003، بە هاوکاری لیژنەی قانوونی پەرلەمان ئامادەتان کـردووە، ئـەو پرۆژەیە چی بەسەرهات؟**

دکتـۆر نـووری: پـێم باشـە لێـرەدا ڕاشـکاوانە بـاس لـەو پرۆژەیـە بکـەم، کـە لـە مـانگی دیسەمبەری 2003، بە هاوکـاری لیژنـەی قـانوونی پەرلـەمان و کـاك فورسـەت ئەحمـەد ئامادەکراوە. کاری ئـەو لیژنەیـە پێداچوونەوە بـوو بـە پـرۆژە دەسـتووری نۆڤەمبـەری

2002، پاش ئەوەی کۆبوونەوەیەکی تایبەتی بۆ ئەو مەبەستە لە سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران بەسترا، بە بەشداری کاك فورسەت و هەموو ئەندامانی لیژنەی قانوونی وەك خوالێخۆشبوو کاك سەعید یەعقوبی سەرۆکی لیژنەی قانوونی و کاکەڕەش نەقشبەندی و کاك شێروان حەیدەری و کاك تاریق جامباز و ئەندامانی تری ئەو لیژنەیە. ئەو لیژنەیە لەسەر پێشنیازی من دامەزرا، پاش چەندین تەگەرە و ئاستەنگێك، توانیمان ئەو ئەرکەی پێمان سپێردرابوو تەواوی بکەین، پرۆژەکە خرایە بەردەستی سەرۆکایەتی پەرلەمان و لایەنە پەیوەندیدارەکانی کوردستان. ئەو پرۆژەیە لە پرۆژەی نۆڤەمبەری 2002 زۆر چاکتربوو، بۆیە 59 پەرلەمانتار لە هەموو گرووپەکانی ناو خولی دووەمی پەرلەمان، لە مانگی حوزەیرانی 2005 لە داواییێکی فەرمیدا داوایان لە سەرۆکایەتی پەرلەمان کرد گفتوگۆی لەسەر بکرێت، بە ئومێدی پەسندکردنی پێش دەستووری عێراق، ئەو داواکارییە تەماشا نەکرا تا دەستووری عێراق پەسندکرا.

بۆ زیاتر ڕووناکی خستنە سەر چۆنییەتی ئامادەکردنی پرۆژەی دیسەمبەری 2003، پێویستە ئاماژە بۆ شێوەی ئامادەکردنی ئەو پرۆژەیە بکەم. لە ئەیلولی 2003 بە یەکجاری گەڕامەوە کوردستان، پاش ماوەیێك یاداشتنامەیەکم پێشکەش بە سەرکردایەتی سیاسیی کوردی کرد. یەکێك لەو داواکارییانە پەیوەندی بە پرۆژەی دەستوورەوە هەبوو، پێشنیازی پێداچوونەوەم پێدا کردبوو لەبەر ئەو گۆڕانکارییانەی لە پاش ڕووخانی رژێمی بەعس لە عێراق و کوردستان ڕوویاندابوو، کە پێویستی دەکرد بە پرۆژەکەدا بچینەوە تا بگونجێت لەگەڵ ئەو بارودۆخە تازەدا.

سەرۆکی حکومەت هاوکاری کردم و کۆبوونەوەیەك لە سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیران ڕێکخرا، بەشی زۆری ئەندامانی لیژنەی قانوونیی پەرلەمان (خولی یەکەم) و سکرتێری پەرلەمان ئامادەی بوون. لەو کۆبوونەوەدا ئامادەیی خۆم بۆ هاوکاریکردن لەگەڵ ئەو لیژنەیە دەربڕی بۆ پێداچوونەوە بە پرۆژەکەی نۆڤەمبەری 2002، ئامادەبووان هەموویان هاوڕا بوون، بڕیاردرا لە رۆژی پاشتر پێکەوە لە لیژنەی قانوونی لە پەرلەمان دەستبەکار بین.

لەو رۆژەدا، بە ئامادەبوونی بەشێك لە ئەندامانی لیژنەکە دەست بە کۆبوونەوە کرا، لە ماوەی چەند سەعاتێکدا، بە تێکڕای دەنگی ئامادەبوان بڕیاری دەستکاریی چەند

ماددەیەك درا. بۆ نموونە، مافی دیاریكردنی پاشەڕۆژی گەلی كوردستان بە ڕوونی لە پرۆژەكەدا چەسپێندرا، ناوی (ئەنجومەنی نیشتیمانی كوردستانی) كرا بە پەرلەمانی كوردستان، لەگەڵ دەستكاریكردنی چەند ماددەیەكی دیكەدا. كاك فرسەت ئەحمەد لەسەرەتای كۆبوونەوەكە لەگەڵمان نەبوو، پاش هاتنی ئەو دەستكارییانەی بڕیاریان لەسەردرابوو، بۆم روون كردەوە. لەوە دەچوو نارەحەت بێت، گوتی دەستكاری زۆرتان لە پرۆژەكەدا كردووە، داوای لێ كردم بە نووسراویی لێكۆڵینەوەیەك ئامادە بكەم بەو دەستكارییانەی دەبێ لە پرۆژەكەدا دەكرێن. پرسیارم لێكرد بۆچی رۆژی پێشتر لەو كۆبوونەوە لە ئەنجومەنی وەزیران بەسترابوو ئەو داوایەی نەخستە ڕوو و هیچ ئیعترازێكی نەبوو؟ گوتم وا خەریكین پێكەوە ماددە بە ماددە بە پرۆژەكەدا دەچینەوە و دەستكاری چەند ماددەیەكمان كردووە و ئیعترازەكەی ئەو دەبێتە هۆی دواكەوتنمان لە ئەنجامدانی كارەكەمان. بەلاّم هەر سووربوو لەسەر قسەكانی، ئەوەش بووە هۆی دواخستنی كارەكانمان بۆ سێ هەفتە.

لەو ماوەدا ئەو لێكۆڵینەوەم ئامادە كرد و بە چاپكراوی بۆ لیژنەكەم نارد، لەگەڵ نامەیەكدا تێیدا پێشنیازم كردبوو پاش هەفتەیەكی تر لیژنەكە كۆبێتەوە.

لە رۆژی دیاریكراودا چوومەوە بۆ پەرلەمان، ئەم جارە كاك فورسەت بیانوێكی تازەی هێنایەوە، گوتی ناتوانین لەسەر كارەكانمان بەردەوام بین ، چونكە رەزامەندی سەرۆكی پەرلەمان وەرنەگیراوە! پێم وتەوە بۆ لەو كۆبوونەوەمان لەگەڵ سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیران ئەو ئیعترازەی نەخستە ڕوو؟ پەرلەمان لە پشوودا بوو، د. ڕۆژ شاوەیس، كە سەرۆكی پەرلەمان بوو، لەگەڵ د. كەمال فوئاد جێگرەكەی هەردووكیان لە دەرەوەی وڵات بوون، زیاتر لە 30 رۆژ چاوەڕێمان كرد تا د. رۆژ گەڕایەوە. ئاگادارکرام هاتووەتەوە و دەیەوێت چاوی پێم بكەوێت، زۆر خۆشحاڵ بوو بەو كارەی دەستمان پێكردبوو، داواشی لێ كردم بەردەوام بین لەسەر تەواوكردنی. پاش چەند رۆژێك دەست بەكاربووین و بەشێكی زۆر لە ماددەكانی پرۆژەكەی نۆڤەمبەری 2002 دەستكاری كران. پرۆژەكە بە چاپكراوی دامە سەرۆكایەتی پەرلەمان و حكومەت و لایەنە پەیوەندیدارەكانی تر. پرۆژەی دیسەمبەری 2003 و هەموو ئەو كارانەی سەبارەت بە دەستوور كراون، لە نامیلكەیەكدا دەزگای (رەنج) لەساڵی 2005 بلاّوی كردەوە. كاتی خۆی ئەو نامیلكەیەم دابەشكرد بەسەر هەموو لایە پەیوەندیدارەكان و پەرلەمانتاران.

